# ئازاليا

«گوڵێک بوو لە بیاباندا ڕوابوو.»



ڕۆمان

مستەفا ئیبڕاهیم

**ناوی کتێب:** ئازالیا

**نووسەر:** مستەفا ئیبڕاهیم

**ژانــر:** ڕۆمان

**ساڵ:** ٢٠٢٠

**مافی بڵاوکردنەوەی پارێزراوە بۆ:**

پەڕەی ***Ktebi_PDF*** لە ئینستاگرام

تێبینی: ئەم کتێبە تەنها بە **PDF** بەردەستە.

# پێشەکی

من مستـەفام, قوتابیـم لە پۆلی یـازدەی ئامـادەیـی. گـەلێـک خۆشحـاڵم کـە خەریـکم پێشـەکی بۆ دووەم کتێبـی خـۆم دەنووسـم, ئامـانجـی من لەو نووسینـانەدا بەخشینـی برێــک چێـژە بە خـوێنـەرانی کتێبخـانەی کـوردی, هیـوادارم بەبـاشی ئامانجـەکـەم بپێـکم, ئـەگەر نەشمتوانی, گەلێک خەجاڵەتم کە کاتی ئێوەم بەفیڕۆداوە.

ڕۆمانی ئازالیا باس لە ژیانی دکتۆرێکی تەنها دەکات. دوایی ئەوەی سەرکەوتنێکی گەورە لە کارەکەیدا تۆماردەکات, دەتوانێت مۆڵەتێکی دوورو درێـژ وەربگرێت و, سەردانی هاوڕێ دێرینەکەی بکات کە چەند هەفتەیەک بەر لە ئێستا پەیوەندی پێوە کـردبوو. لەمیـانەی گەشتـەکەیدا بۆ سەردانی هاوڕێکـەی تووشی چەنـدەها ڕووداو دەبێت.

**مستەفا ئیبڕاهیم**

**١٧ـی ئەیلولی ٢٠٢٠**

پێشکەشە بەو **گوڵەی** لە بیابانەکەی مندا ڕوواوە..

# ١

نزیکی ساڵێک پێش ئێستا باوکم و براکەم، پێرێش دایکم مرد.

لەم ئێوارە ساردەی زستاندا، پێش ئەوەی بڕۆم، دەتوانم تەنها نامەیەکی

غەمگین، بۆ باوکم بنووسم.

# ٢

**سوپاسێکی درەنگ کەوتوو..**

سوپاس باوکە, کە بەخێوت کردم و، منت گەیاندە ئێرە. ئەو شتانەی کە

دەمویستـن, گشتیانت بۆ دابین کردم، ئەوەنـدە بـــەسبـوو؟ بێگومـان نـا،

باوکە دەزانی؟ من هیچ ساتێک، هەستم بە بوونـــی سۆزی باوک نەکـرد.

هەرچەند مردوویت، بەڵام هیوادارم خودا ئەم نامەیەی منت پێبگەیەنـــێ.

دەشزانم کەمێک درەنگ بووە.

باوکە زۆر گلەییم لێت هەن، بۆچی منت لە هەموو شتێک ترساند؟ بیـرتە

دەتگـوت: هەر شتێکـی خراپ هەبێـت و، نەتـوانـی بـەسـەریـدا زاڵ بیـت.

لـە کـۆتـاییـدا لەگەڵـت دەژیـت, ئێستا ترس لەگـەڵ منـدا دەژی بـــاوکــە.

هیــچ ســاتێـک بـە بینینـــی چـاوەکانـت هەسـتــم بـەو ئـارامـیـە نـــەکــرد,

کە لە ڕۆمانەکانـدا باسدەکرێت. ڕاستـە، هەندێــک شتت لێـوە فێـربـووم،

بەڵام گەر تۆش نەبوویتایە, ڕۆژێک دەهات خۆم فێریـان بـبـم. ئێ بـاوکـە

تۆ قەت لێت نەپرسیم داخۆ چ ڕەنگێکم لاجوانە. یان حەزم بە کام جۆرە

مۆسیقایە. ببورە تۆزێک تێکەڵم کرد.

بەهەرحاڵ ژیان ئەوەندەی بۆمن دانابوو... من تۆم بەخشیووە باوکە.

ماڵئاوا, خۆ ماڵئاواییشـت لێنەکردم،

**خۆشمدەوێیت..**

# ٣

ئەلبێرتۆ بە دڵتەنگییەوە نامەکەی لەسەر مێزەکە دانــا. چووە ژوورەکــەی

تا خۆی بۆ گەشتەکەی ئامادەبکات.

دوو هەفتـــە پێش ئێستا ژنێـکی نەزۆک, کە تاقە نەخۆشی ئەلبێرتۆ بوو,

بوو بە دایک.

ئەمە بووە هۆکاری ئەوەی, بەڕێوەبەر و گشت پزیشـک و کارمــەنـدەکانــی

ئەو نەخۆشخانەیە, بیرکردنەوەیان دەربارەی ئەلبێرتۆ بگۆڕێت. کە پێشتر

وا تێگەیشتبوون, کەسێکی ساردوسڕ و بێخوڵقـە لەسەر کارەکەی, گشـت

سەرلەبەیانییەک دەیانگوت: جەنابـی دکتـــۆر, نەخۆشێکت پــەیانــەکـرد؟

جا دەیان دایە قاقای پێکەنین. ئەلبێرتۆ کە لەو نەخۆشخانـەیــە تەنــها

دەرمانی دەدا بە نەخۆشەکان. کە ئیشی ئەو نەبوو.

ڕۆژێکی نوێ. ساڵێک پێش ئێستا. ئەلبێرتۆ زۆر تووڕە بوو. چووە ژووری بەڕێوەبەر.

بە توندی دەرگاکەی کردەوە, ڕاندۆنی بەڕێوەبەر ترس دایگرت. لەو چاوە

سوور و پڕ لە تووڕەییانەی ئەلبێرتۆ دەترسا.

ئەلبێرتۆ هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: یەکەم نەخۆش کە ئەمڕۆ دێت,

نەخۆشی منە.

ڕاندۆن کەمێک ترسی ڕەویەوە, گوتی: باشە لاریم نیە, تاقیبکـەوە. بەڵام

پێشوەختە دەبێ ئیمزایەک لەسەر ئەو وەرەقەیە بکەیت.

ئەلبێرتۆ گوتی: ئەوە بۆ چیە؟

ڕاندۆن گوتی: ئەوە بۆ ئەوەیە, گەر هەرشتێک بەسەر نەخۆشەکەدا بێت.

تەواوی بەرپرسیاریەکەی لە ئەستۆی تۆیە.

ئـەلبـێـرتـۆ پێکەنـی. بە دەنگێکـی پڕ لـە متمانـە بە خۆبـوونــەوە گوتـی:

یەک ئیمزا بەسە؟

ڕاندۆن گوتی: بەڵێ, تەنها یەک دانە.

ئەلبێرتۆ وەرەقەکەی ئیمزا کرد. ویستی بچێتە دەرێ.

# ٤

ڕاندۆن گوتی: دەزانی ئەلبێرتۆ, شتێک هەیە.

ئەلبێرتۆ کە ئەوەی بیست سەری سوڕما! ئاوڕی دایەوەو, گوتی: فەرموو,

چی هەیە بیڵێ.

ساتێک بێدەنگ بوو.

گوتی: نا نا هیچ نیە, بڕۆ. بەهیوای بەختێکی باش.

ئەلبێرتۆش بەدڵخۆشییەوە ڕۆیشت.

کە دەرگاکەی داخستەوە, لەبەرخۆییەوە, بە پێکەنینەوە گوتی:

خۆ دەکرا زووتر وابکەم. باوەڕم بەو بەختەی ڕاندۆن نیە, بەختێکی باش

دکتۆر ئەلبێرتۆ.

# ٥

**سڵاوێک لە چاوەڕوانی بەهاردا..**

کۆتا ڕۆژی زستانە, لە پێش وێستــگەکە وەستاوم. ئێجگار سـاردە, بەڵام

گەرم بوونەوەی ئەو ژوورە تەنگ و تاریکەی وێستگەکەم ناوێت.

سروشت سەوز و بەهــاراویـی, جارنـاجارێکیـش بایـەکـی ساردی زستـانە

هەڵم دەلەرزێنێ. بە گشتی ڕۆژێکی خۆشە.

بیست خولەکی تر شەمەندەفەرەکە دەگات. منیش لێرەوە سێ وێسـتگەی

تری لەگەڵ تێدەپەڕێنم. ئەوێ شاری سینیزیایە, ئەو وێستــگەیەشـــی من

لێی دادەبەزم, دەکەوێتە بەرامبەر نەخۆشخانەی ***ڤالا دی سێیستیان***.

لەوێ چاوپێکەوتنی دامەزراندنم هەیە.

مامم ئەو شوێنەی بۆ دۆزیومەتەوە, گوتی کە بەڕێوبەرەکە داوای کردووە

ڕۆژێک بۆ چاوپێکەوتن دیاری بکەم. بێگومان خۆشەویستترین ڕۆژی مــن

ئەمڕۆیە. کۆتا ڕۆژی زستان.

دەمەوێ ڕۆژی دەستپێکی کـارەکەم لە هەمان دەستپێـکی بـەهـاردا بێت.

**( پێنـج خولەکـی تر لـە وێستگـەی یەکەمی شاری سینیزیا دەوەستین. )**

سڵاو ئێرە شاری سینیزیایە, من دکتۆر ئەلبێرتۆم.

# ٦

**ئای کە ڕۆژێکی ناخۆش بوو..**

کورسیەکەی تەنیشتم چۆڵە و بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا بە دڵتەنگیەوە لـە

دیمەنی خۆرئاوابوون دەڕوانم. خۆریش مەیلی ئاوابوونی نیە, بەڵام هەندێ

خەڵک چاوەڕێی مانگن, بۆیە ناچارە ئاوابێت.

چووم بۆ چاوپێکەوتنەکە, بە ملیشکاوم, نەدەبوو بچم. ئاخر قسەکردن و

گفتـوگۆ لەگـەڵ ئەو هـەموو لەخۆباییـە کێشەیە, دەبێ ژیـان و کارکـردن

لەگەڵیان چی بێت!

ئەی گشت سەرلـەبەیانیەک ئەو ڕووخسارە ناشرین و تەماحکارانە ببینیت!

هەستەکەم بەزەییان پێمدا هاتبێتەوە, بۆیە دایانمەزراندم, بۆ چما خۆشم

بەزەییم بەخۆمدا نایەتەوە؟

ئێ..

گەیشتمەوەماڵەوە, دایکم لێرە نییە, بەڵام هەر دێتەوە. نازانم چۆن بۆی

بگێڕمەوە؟ بەهەرحاڵ, سبەی دەستپێکی بەهارە, دەبێ زوو هەستم..

# ٧

**سڵاو بەڕێز ڕاندۆن..**

ئەمانەی خوێندتەوە, لە ڕۆژی چاوپێکەوتنەکەدا نووسیوومن, دەزانم بۆتۆ

شتێکی سەرسوڕهێنەر نیە.

ناتوانم خۆم بێنمە شوێنی تۆ یان هەست بەوە بکەم چەند ڕقت لی خۆت

دەبێتەوە! دەشکرێ ئەو ڕۆژەت هەر بیر نەمابێت, بەڵام دوایی ئەوەی لـە

خوێندنەوەی نامەکە تەواو دەبیت, بیرت دێتەوە.

دەزانی من ویستی ئەوەم نەبوو, تۆڵەت لێبکەمەوە, هەر بە خەیاڵیـشمدا

نەهاتبوو, بەڵام تۆڵەم کردەوە, شتێکی خۆنەویستانە؛ لە خـۆوە دەستی

پێکرد, لە خـۆوە کۆتایی هات!

نووسەرێکی باشم, وایە؟ حەزدەکەم چیرۆکێک بنووسم:

**"تۆڵەکردنەوە لە ڕاندۆن!"**

چۆن دەزانم کە ڕقت لێم نەبوو, ئاواش دەزانم خۆشت دەویستم. ئەگــەر

بەهۆی مامەوە بووبێت یان هەر شتێکی تر, لام گرنگ نیە. ئەها شتێکی

تر, ئەو ڕۆژەی یەکەم نەخۆش هاتە لام, گوتت: شتێک هەیە و نەتـگوت,

گەشتەکەم دووڕۆژ دوادەکەوێ, لە کۆتایی ئەم نامەیە بۆشاییەک جێدێڵم

هیوادارم بۆم بنووسیت کە ئەو شتە چیبوو؟

ئەگەر ویستــی هەڵـگرتـنی نامـەکەمت هەیە, لەسەر کــاغەزێـکی تر بـۆم

بنووســە. لە هەمـان ئەو شوێنــەی دابنێ, نامــەکەمت لێ هەڵـگرتــەوە,

سەرلەبەیانی سبەی لەوێ دەبم, هیوادارم نامەکەی بۆم دەنووسی, لەوێ

بێت. سوپاس بۆ هەموو شتێک..

# ٨

بەیانیەکی سارد و تەماویی, گەر کارێکی گرنگت نەبێت و
لەدەرەوە بیت,

گەمژەییت!

دکتۆر ئەلبێرتۆ لەسەر کورسیەکەی دانیشتووە, چاوەڕێی یەکەم
نەخـۆش

دەکات.

-بەخێربێیت, فەرموو باسی نەخۆشیەکەت بکە..

ئەلبێرتۆ قاقای لێدا.

-خۆ نەبوومەتە ئەکتەر.

لە گەرمەی گفتوگۆدا بوو لەگەڵ خۆی, لە دەرگا درا!

ئەلبێرتۆ هەناسـەی سـوار بوو, چەنـد هەناسـەیەکی قـووڵی
هەڵـکێـشا,

هەستایە سەرپێ و ویستی بچێ دەرگاکە بکاتەوە.

کێشای بە نێوچەوانی خۆیدا! بە پرتەوە گوتی:

-گەمژە, خۆ میوانت نەهاتووە.

لەسەر کورسیەکەی دانیشت, لەسەر پارچە کاغەزێک نووسی:

**(ئێستا چیرۆکێک دەست پێدەکەین.)**

# ٩

-فەرموو

-ژن و پیاوێـك هاتنە ژوورەوە، ژنەكە دەگریـــا و سەری لەسەر سینـگی پیاوەكەی بوو. دیمەنێـك بوو مرۆڤی تەواو خەمبـــار دەكرد، بۆ ساتێـك نەمدەتوانی بیر لە هیچ شتێك بكەمەوە، لە یەكەم ڕۆژی كاردا هەستێكی سەیرم هەبوو!

دوایی بینینی ئەم دیمەنە، ئەو دڵخۆشیەم نەما كە پێـش ئێستا هەمبوو، هەر چۆنێك بێ ویستم هێزی قسەكردن بدەمەوە بەر خۆم، گوتم:

-بەخێربێن.

ژوورەكە هەروا بێدەنگ مایەوە، تەنها دەنگی گریان هەبوو!

نەمدەویســت بڵێـم مەگــری، چونكـە دەمزانی بــەم گریانــە كەمێـك لە خەمبـاریـەكـەی كەم دەبێت. بەڵام چەند كاتژمێرێك وا بێـدەنگ بین هیچ كاممان سوودی پێ ناگا. بۆیە دەستم كرد بە قسەكردن:

-نـازانم هۆكـار چیه كه دەبێت خانمێـكی وا جــوان بگری؟ ناشزانم كه دەتوانم شتێـكت بۆ بكەم یان نا؟ هەوڵدەدەم، وە تەواوی توانام بۆ ئەم كاره تەرخان دەكەم، تكایه مەگری و قسەبكه.

پیــاوەكەی كه نەدەگریا، بەڵام له ڕووخساری دەبینــرا كه چەند هێندەی هاوسەرەكەی خەمباره.

-نازانم تۆ دەبیته چەندەم دكتۆر كه سەردانمــان كــردووه، بەڵام دەزانــم نوێیت و یەكەم كاره بۆ تۆ..

-بەڕێز، ئەوان، ئەوان بوون، منیش، منم. هیوادارم هەمیشه لەبیرت بێت كه نابێ به گشتی بڕیار بدەیت.

پیاوەكه بزەیەكی كرد.

-ئێمەش بەو هیوایەوە لێرەین، دەڵێـن كه تۆ زۆر باش كارەكان دەكەیت، تەنها..

-ڕاسته، هەندێك جار كارەكانم پشگوێ دەخەم، بەڵام ناتوانم گریانێــكی وا پشگوێ بخەم.

-یەكەم جارته نەخۆش دێته لات، وایه؟

-ئەرێ، یەكەم جارمه.

-پێدەچێ ئەزموونێكی باشت هەبێت!

پیـاوەكه هــەنـاســەیەكــی هەڵكێشــا، هەناسەیەكـی خەمــاوی و قــووڵ، هاوسەرەكــەی لەسەر كورسیەكــه دانیشانـــد و لای پەنجەرەكه وەستا و سەیری شاری دەكرد.

-ئێمه منــاڵمان نابێــت، ناوی تەواوی ئەو شەقامـانــه دەزانم كه لێـرەوە دیارن، بەبۆنــەی ئەم بابەتــەوە تەواوی وڵات گـەڕاوم و

دكتۆرێك نەماوە نەیناسم. ئەمڕۆ یادی پێنج ساڵەی هاوسەرگیــریمانــە، نازانم دەزانی یان نا؟ لەم بۆنەیەدا ئەوەی بە تەواوی مرۆڤ دەڕووخێنێــێ ئەوەیە، منالێـك نەبێ بە یادی هاوسەرگیـــری دایك و باوكی دڵخۆش بێت و پێبــكەنێت. كێشەكەی من سالێكە چارەسەركراوە، بەڵام..

ئەلبێرتۆ ڕووی كردە ژنەكە.

-دەزانی خانم من كەسێكی لە خۆباییم؟

ئافرەتەكە تەنها سەیرێكی كرد، وەك ئەوەی پرسیار بكا:

(ئەوە چ پەیوەندیەكی بە منەوە هەیە ؟)

-لەخۆباییم. چونكە دەتوانم ئەم كێشەیە چارەسەر بكــەم، وە تۆ دەبیـت بەدایك.

ئەلبێرتــۆ نەیدەویســت درۆ لەگــەڵ خۆیــدا بكا، بەڵام گەر گریـانەكــەی بوەستــایە، ناچــار دەبــووم كە چارەسەرێــك بدۆزمەوە، بێــگومــان هیچ ڕێگایەكی تریشم نیە.

ژنەكە گریانی وەستا! هەستا و لەلای هاوسەرەكەی وەستــاو بـزەیــەكــی كرد.

لەسەر كاغەزەكەی بەردەمم نووسیم:

**(یەكەم ڕۆژ، یەكەم بەڵێن و سەرەتای چیرۆكەكە.!)**

# ١٠

شەوێکــی بێدەنــگە.. چەنـد پــەڵـە هەورێـکی تەنــك بە ئاسمـــانەوەن. کێشـەیـەك لە وێستــگەی کـارەبــا کەوتوەتـەوە، شار تەواو تاریکە بەڵام مانگ بەشێـکی زۆری شەقامەکانـــی ڕۆشــن کردۆتەوە، چرایــەك لەســەر مێــزێك داگیرســاوەو ڕووناکیەکی کز لە پەنجەرەیەك دێتە دەرەوە، ئەوە دکتۆر ئەلبێرتۆیە خەریکی دانانـی پلانـە، هەنگاوەکـان دەنووسێ و ڕێکیان دەخا..

ئەمە کارێکی مەزنە, وە ئەزموونێکی باشدەبێت بۆم. نابێت بترسم, تەنها

گرنگی بە کارەکەم دەدەم و, پشگوێی ناخەم. ئەو منااڵە دێت, وە بە من

دەڵێ: مامە!

ڕۆژی یەکەم..

ڕۆژی دووەم..

ڕۆژی سێیەم..

.

.

.

.

ڕۆژی سییەم (ئێستا ئامادەییت ببیتە دایك.)

ئەلبێرتۆ هاواری کرد:

-بەڵێ. ئەمە کاری پاڵەوانە..!

# ١١

ئەلبێرتۆ بڕوای وابوو سەرکێشی کارێکی ڕاستە و چێژ بە ژیان دەبەخشێ، بەڵام خەریکی سەرکێشیەکی گەورە بوو! بەجۆرێك کە دەکرا ژیان بە کەسێک ببەخشێتەوە, یان بە تەواوی لێیوەربگرێتەوە. لە نێو هەموو چارەسەکاندا کە بۆ ئافرەتەکەی دانابوو، یەك چارەسەری پزیشکی هەبوو.! ئەوانی تر چارەسەری دەروونی، چێژ بەخشین بە ژیان و هێنانی شتی نوێ بۆ نێو ژیانی، ئەنجامدانی خولیاکانی و گەشتکردن، ئەمانە هێز بە مرۆڤ دەبەخشن. هەرچەندە وادەزانین شتی سادە و لاوەکین, بەڵام دەکرێ چارەسەر بن.. ئەلبێرتۆ دەیزانی مرۆڤ پێویستی بە چی هەیە بۆ ژیانێکی باش و تەندروست، دەکرێ ئەم خانمەش کێشەیەکی هەبێ پەیوەندی بە کێشەی نەزۆکیەوە نەبێ، ئەگەری زۆر لە مێشکیدا هەبوون، لەکۆتاییدا سەرکێشی هەڵبژارد.

بەوپەڕی متمانەوە، دکتۆرێکی گەنج بەرەو ماڵێك بەڕێکەوت، ماڵێك کە ساڵانێك بوو دوو هاوسەری تیا دەژیان، بەڵام هیچ دەنگێکی ئاوەدانی لەو ماڵە نەدەهات، پیاوەکە بە ئەلبێرتۆی

گوتبــوو کــەوا هاوسەرەکــەی حەزی بە میوانــداریکـردنــی خەڵکی نیە، بەتایبەت ئەوانــەی بە منالّــەوە دێن، ئەوە ئازاری دەدا..

# ١٢

-بەرەو کۆنە شەقامەکەی مینیزەر لێخوڕە..

ئەلبێرتۆ خۆی ئۆتۆمبێلی هەبوو، بەبێ ئەوەی هیچ هۆیەك هەبێ ویستی بە ئۆتۆمبێلی کرێ بچێت، بۆیە ئۆتۆمبێلێکی بەکرێ گرت..

کاتێك لە دەروازەی شارۆچکەی مینیزەر تێپەڕین..

-خودایە! ئەمە چ سروشتێکی جوانە! (ئەلبێرتۆ وای گوت.)

-ناوازەیە بەڕاستی، شوێنی وا دڵڕفێن هەن لە وڵاتەکاندا، مرۆڤی گەمژەش حەزی بە شاری پڕ لە دووکەڵ و ناشرینیە.! کە دێیت و شوێنی وا دەبینیت، گومان دەکەیت پێشتر مرۆڤ بووبیت لەوەدەچێ هەر نەژیابیت. (شۆفێرەکە وای گوت.)

ئەلبێرتۆ پێکەنی و گوتی:

-زۆرمان ماوە بگەین؟

-پانزه خولەکێکی تر لەو جێیە دەبیت کە دەتەوێ.

-زۆرباشە، سوپاس.

# ١٣

یەکشەممەیەکی ساردی ئۆکتۆبەر، بەدەگمەن خەڵك لە دەرەوە دەبینرێ، زۆربەی لە پەنجەرەکانــەوە لە شار دەڕوانــن، فرۆشــگاکــان داخــراون و پاڕکەکانیش چۆڵن، بەفر سەراپـای شـاری تەنیووە، وێستگەی تەکسی و شوێنی وەستانی سواڵکەرەکانیـش هیـچ کەسێکی لێ نیە، کوڕێکی گەنـج شیـری گــەرم بۆ خۆی و دایکــی ئامادە دەکـا، دایکی ئەلبێرتـۆ ئــەمڕۆ حاڵی باش نیە، نەخۆشیەکەی بەتەواوی لە جووڵــەی خستووە، دوێنێش دکتۆر گوتبووی:

-بەداخەوەم بەڕێز ئەلبێرتۆ، دایکــت هیــچ هیوایەکــی نیە بۆ هەستانەوە سەر پێ، ئـەم ماوەی لە ژیانیــدا ماوە لە ژێر جێـــگادا بەسەری دەبات، دەبێت باش ئاگاداری بن.

-بەڵام من..

-ئافرەتێـك بــدۆزەوە تــا لەگەڵــی بــژی و ئاگاداری بێــت، گونجـاوتــرە و دایکیشت ئاسوودەتر دەبێت.

-زۆر باش دەبێت، سوپاس دکتۆر.

بەیانــی بڕیارە ئەو ئافرەتە بگات کە ئەلبێرتۆ دۆزیویەتیەوە، ئەمڕۆ خۆی ئاگاداری دایکی دەبێت.

ئەلبێرتۆ کە هاتە ئەم شارە نوێیە دوو خانووی لە تەنیـشت یەکدی کڕی، وای لا باشتر بوو، نەیدەویستماڵەکەی دایکی پەرشوبڵاوبێت و ماندووی بکا، بۆیـە کەلوپەلەکانی خۆی لە خانووەکەی خـۆی دانا، بەڵام زۆربــەی کاتەکانی هەر لای دایکی بەسەر دەبرد..

# ١٤

کوڕ و دایك شیر دەخۆنەوەو قسە دەکەن، دایکی کەمێك باشترە.

-دیسان شەکرت زیاد تێکردووە!

-ببورە دایکە، هەڵەم کرد دیسان.

-ئەلبێرتۆ، ئەو کچە..

-ناوی جانیایە دایکە.

-ئەریٚ، ئەو دەڵێم، بەیانی بڕیارە بێت. بۆیە نامەویٚ هەموو کاتێك لێرە بیت، با ئاسوودە بێت.

-باشە دایکە.

-بەڵام کاتێکی ئەو خەوت، دەمەویٚ بێیت، هەندیٚ شتی گرنگ هەیە دەمەویٚ بۆتی باس بکەم..

-زۆرباشە دایکە، بەپەرۆشم بۆئەوەی قسەکان ببیستم, هیوادارم چیرۆکی نوێم بۆ بگێڕیتەوە.

-هێشتا گەورە نەبوویت.

-نا, پێویست نیه.

-هاوسەری هەیە؟

-ئەریٚ، کچێکیشی هەیە.

-دەمەویٚ باوەشم پێدابکەیت ئەلبێرت.

ئەلبێرتــۆ بە تونــدی دایکی لە باوەش گــرت، دەنــگی هەناسە کـزەکانی دایکی دەبیست.

-بەسە گێژە، دەخنکێم!

ئەلبێرتۆ پێکەنی.

-بمبورە بمبورە.

-دەی بڕۆ با بەیانی درەنگ نەکەوی بۆ کارەکەت.

-شەوشاد، خەوێکی خۆش دایکە.

-شەوت شاد ئەزیزەکەم.

# ١٥

-فەرموو

-ژن و پیاوێك هاتنە ژوورەوە، ژنەکە دەگریا و سەری لەسەر سینگی پیاوەکەی بوو. دیمەنێك بوو مرۆڤی خەمبار دەکرد، بۆ ساتێک نەمدەتوانی بیر لە هیچ شتێك بکەمەوە، لە یەکەم ڕۆژی کاردا هەستێکی سەیرم هەبوو!

دوایی بینینی ئەم دیمەنە، ئەو دڵخۆشیەم نەما کە پێش ئێستا هەمبوو، هەر چۆنێك بێ ویستم هێزی قسەکردن بدەمەوە بەر خۆم، گوتم:

-بەخێربێن.

ژوورەکەم هەروا بێدەنگ مایەوە، تەنها دەنگی گریان هەبوو.

نەمدەویست بڵێم مەگری، چونکە دەمزانی بەم گریانە کەمێك لە خەمباریەکەی نامێنێ، بەڵام چەند کاتژمێرێك وا بێدەنگ بین هیچ کەس سوودی پێ ناگا. بۆیە دەستم کرد بە قسەکردن:

-نازانم هۆکار چیە کە دەبێت خانمێکی وا جوان بگری؟ ناشزانم کە دەتوانم شتێکت بۆ بکەم یان نا؟ هەوڵدەدەم، وە

تەواوی توانـــام بۆ ئەم کارە تەرخان دەکەم، تکایە مەگری و قسەبکە.

پیاوەکەی کە نەدەگریا، بـەڵام لە ڕووخسـاری دەبینرا کە چەند هێـنـدەی هاوسەرەکەی خەمبارە.

-نازانم تۆ دەبیتە چەندەم دکتۆر کە سەردانمــان کـردووە، بـەڵام دەزانــم نوێیت و یەکەم کارە بۆ تۆ..

-بەڕێز، ئەوان، ئەوان بوون، منیش، منم. هیوادارم هەمیشە لەبیرت بێــت کە نابێ بە گشتی بڕیار بدەیت.

پیاوەکە بزەیەکی کرد.

-ئێمەش بەو هیوایەوە لێرەین، دەڵێن کە تۆ زۆر باش کارەکان دەکەیـت، تەنها..

-ڕاستە، هەندێك جار کارەکانم پشگوێ دەخەم، بەڵام ناتـوانـم گریانێـکی وا پشگوێ بخەم.

-یەکەم جارتە نەخۆش دێتە لات، وایە؟

-ئەرێ، یەکەم جارمە.

-پێدەچێ ئەزموونێکی باشت هەبێت!

پیـاوەکــە هەناسەیەکـی هەڵکـێشـا، هەنـاسـەیـەکـی خـەماوی و قــووڵ، هاوسەرەکەی لەسەر کورسیەکە دانیشانــد و لای پەنجـەرەکــە وەستــا و سەیری شاری دەکرد.

-ئێمـە منـاڵمــان نابێت، ناوی تەواوی ئەو شەقامانـە دەزانـم کە لێـــرەوە دەبینـدرێـن و نابـیـنـدرێـن، بەبۆنـەی ئەم بابەتـەوە تــەواوی وڵات گـەڕاوم و دکتۆرێــك نەماوە نەیناسم. ئەمڕۆ یادی

پێنج ساڵەی هاوسەرگیریمانە، نازانم دەزانی یان نا؟ لەم بۆنەیەدا ئەوەی بە تەواوی مرۆڤ دەڕووخێنێ ئەوەیە، مناڵێك نەبێ بە یادی هاوسەرگیری دایك و باوكی دڵخۆش بێت و پێبكەنێت. كێشەكەی من ساڵێكە چارەسەركراوە، بەڵام..

ئەلبێرتۆ ڕووی كردە ژنەكە.

-دەزانی خانم من كەسێكی لە خۆباییم؟

ئافرەتەكە تەنها سەیرێكی كرد، وەك ئەوەی پرسیار بكا (ئەوە بە من چی؟)

-لەخۆباییم. چونكە دەتوانم ئەم كێشەیە چارەسەر بكەم، وە تۆ دەبیت بەدایك.

ئەلبێرتۆ نەیدەویست درۆ لەگەڵ خۆیدا بكا، بەڵام گەر گریانەكەی بوەستایە، ناچار دەبووم كە چارەسەرێك بدۆزمەوە، بێگومان هیچ ڕێگایەكی تریشم نیە.

ژنەكە گریانی وەستا! هەستا و لەلای هاوسەرەكەی وەستا سەیری كرد. وە بزەیەكی كرد.

لەسەر كاغەزەكەی بەردەمم نووسیم:

(یەكەم ڕۆژ، یەكەم بەڵێن و سەرەتای چیرۆكەكە.!)

# ١

بۆ بەیانی جانیا گەیشت، لەو ڕۆژەدا وانەی کۆتایی دەستی پێدەکرد. دایکم کاتێکی زۆری نیە.

جانیا خوشکی یەکێك لە هاوڕێکانمە لە زانکۆ، ئەو خزمەتکار نیە. کە داوام لێیکرد بۆ ئەم کارە پێم گووت:

دەمەوێ لەگەڵی بژیت و بگونجێیت، نەك خزمەتی بکەیت.

جانیا هەر زوو هاوڕێیەتیەکی باشی لەگەڵ خاتوو بینیدا پەیداکرد، بینی بەبوونی جانیا لە ماڵەکەیدا شادومان بوو.

جانیا هەر زوو دەستی پێکرد، چێشتی ئامادەکرد و جلی نوێی کردە بەری، ماڵەکەی پاك کردەوە و ڕێکی خست.

کە شەو هات، بەیەکەوە دانیشتن و قسەیان دەکرد، باسی ژیان، هاوڕێیەتی و خۆشەویستی.

-خۆشحاڵم کە هاتیت بۆ ئێرە.

-بەڕاستی منیش خۆشحاڵم کە لێرەم، دڵخۆشیەکی سەیرم هەیە لەگەڵ تۆدا، ناسینی مرۆڤێکی وەك تۆ بۆ هەموو مرۆڤێك پێویستە.

# ٢

خاتوو بینی و جانیا قسەیان دەکرد، کچە بچکۆڵەکەی جانیا لە خەو هەستا، دەستی کرد بە گریان، جانیا هێنایە لای خۆی و ژێری کردەوە، کاتێك سەیری خاتوو بینی کرد، بینی چەند میهرەبانانە لە مناڵەکەی دەڕوانێ، گوتی:

-دەتەوێ کەمێك لات بێت؟

-بەڵێ بێگومان، مناڵێکی خوێن شیرین و ژیکەڵەیە.

جانیا پێکەنی.

-خۆ هەمووان هەر وادەڵێن.

-ناوی چیە؟

-ئانیا.

-ناوێکی جوانە، لەوەی تۆ دەچێ، هیوادارم خۆشی لە تۆ بچێ، وە باشتریش بێت!

-منیش هیوادارم وابێت.

جانیا کچێکی جوان بوو، میهرەبان و سادە، هەمیشە پێدەکەنی، وە گورجوگۆڵیش بوو.

-هاوسەرەکەت چ کارەیە؟

-ئەندازیاری بیناسازیە.

-منیش ئاواتم ئەوەبوو ببمە ئەندازیاری بیناسازی.

-مامۆستای بۆ تۆ باشتر بووە.

-چۆن دەزانی مامۆستا بووم!؟

-هەموو کەسێك دەتوانێ ئەمە بزانێت کاتێك قسەت لەگەڵ دەکات.

خاتوو بینی بزەیەکی کرد، وەك ئەوەی بڵێ: زۆر ئاقڵیت.

جانیا باسی خانووەکەیان و، ئەو شارەی بۆ دەکرد کە لێوەی هاتووە، بینی چاوەکانی پڕ فرمێسك بوون و گوتی:

-ئەوەی باسیدەکەی، هەر ئەو شوێنەی بە منداڵی خەیاڵم دەکرد ڕۆژانێك لێی بژیم!

# ٣

جانیا ئیزنی وەرگرت کە بچێتە ژوورەکەی پشووبدا، بینیش لە پەنجەرەکەوە ئاماژەیەکی بۆ ئەلبێرتۆ کرد.

-سڵاو دایکە، تەندروستیت چۆنە؟

-زۆرباشترم، بەخێرهاتی کوڕم.

ئەلبێرتۆ هیچ قسەی نەکرد.

-دەزانی ئەلبێرت دووەمجارە لە ژیانتدا کارێکی باش بکەیت!؟

-دووەمجار؟

-ئەری، دووەمیانە.

-جاری یەکەم کەی بوو؟

بینی پێکەنی.

-بیرم نایەتەوە، بەڵام هاتنی جانیا لام نامۆ نەبوو، بۆیە وای بۆ دەچم دووەمجارت بێت.

-دڵخۆش دەبم گەر توانیبێتم کارێکی باش بکەم!

-تۆ کوڕێکی زۆر باشی ئەلبێرتۆ.

-سوپاس دایکە، وام چونکە کوڕی تۆم.

-هاوڕێکانت چۆنن؟

ئەلبێرتۆ پێکەنی!

-هاها، هاوڕێکانم؟

-دەزانم، دەنگت بەرز مەکەوە. لەوانەیە خەوتبن.

-باشە.

-ڕاستی بڵێم نامەوێ هاوڕێت هەبێت، پێشتر دەمویست چونکە مرۆڤ تا بە باشی پێبگا پێویستی بە کەسێکە کە لێی تێبگا و هاوڕێ باشترین کەسی دەبێ، بەڵام تۆ باشترینترت دۆزیەوە کە لێت تێبگا!

-کێم دۆزیەوە؟

-خۆت.

# ٤

دایکم چاوەکانی داخستن، دەستەکانیشی دەجولاَند، بۆ دەربڕینێکی باش پێویست بوو دەستی بجوولێنێ، وە پێش يۆەوەی دەست بە قسەبکا چاوی دادەخست، وابزانم لەو هەموو شتەی لە مێشکی دابوو دەیویست کەمێك لە پێویستەکان دیاری بکا و پێمی بڵێ..

-دەزانی من هەرگیز ڕقم لێت نەبووە، وە هیچ کاتێکیش نەمویستووە لە کۆڵ خۆمت بکەمەوە، بۆ نموونە يۆەوکاتانەی زۆرم لێدەکردی بچیتە دەرەوە، تۆ يۆاقلانە مامەڵەت لەگەڵ تەمەنتدا نەکرد، خۆت نەگونجاند. يۆێستا من هەر هەمان يۆەلبێرتۆی ١٠ ساڵ پێش يۆێستا و ٢٠ ساڵ پێش يۆێستا دەبینم! هەمان بیرکردنەوە و هیچ نەگۆڕاوە، وایە؟

-وایە، لە ژیاندا گۆڕانی زۆر پێویست نیە، تەنها پێویستە بیرکردنەوەکانت بەرەو پێش ببەیت وە باشتر ببیت، بەڕای من وایە.

-یەکێك لەو بیرکردنەوانەتم پێ بڵێ کە پێش کەوتووە..

-لە ٦ساڵیدا بیرمدەکردەوە لەوەی کە من پێویستم بە هاوڕێ نیە، کە گەیشتمە ١٢ ساڵی سوور بووم لەسەری، من پێویستم بە هاوڕێ نیە جا چی کچ بێت یان کوڕ. لە ١٨ ساڵیدا دەمزانی پێویستم بە هاوڕێ نیە، وە کوڕ و کچیش لە هاوڕێیەتی جیاوازیان نیە، ئەوکاتە تێگەیشتم دەکرێ هاوڕێم نەبێت بەڵام ئاساییە خەڵکی زۆر بناسم. لە ٢٠ ساڵیدا شتێکی ترم زانی، پێویستم بە خۆشەویست نیە، کچەکان بیانووی زۆر دەگرن، وە پرسیاری زۆر دەکەن و نازت بەسەردا دەکەن، من ناتوانم لەگەڵ ئەوەدا بگونجێم و متمانەم بەخۆم نیە بۆ ئەوەی خۆشەویستم هەبێت، چونکە ناتوانم مافەکانی پێ بدەم و لەگەڵی بم بە باشی. ئەمانە لە یەك بیرکردنەوەوە سەری هەڵدا، بە گەورەبوونی تەمەنم بەرەو پێشچوو و شتی تری بۆ زیاد بوو..

# ٥

دوانیوەڕۆیە، دایکم بردووەتە پارك بۆ پیاسە، لەسەر کورسیەو
ناتوانێ بجوولێ، دەبێ پاڵی پێوە بنێم و بیبەمە ئەو شوێنانەی پێی
خۆشە، خۆ ئەگەر کورسیش نەبێ ئامادەم بیخەمە کۆڵم و
بەتەواوی وڵاتدا بیگێڕم، زۆرم خۆشدەوێ.

**لێبووردەیی..**

-من هەمیشە لێبووردە بووم ئەلبێرت، گەمژانەیە بەڵام،
لێبووردەیی زۆر جوانە، هەر کاتێك لە ژیانمدا دڵم شکێدرابێ یان
ستەمم لێکرابێ بە لێبووردەیی لەبیرم کردووە، پشگوێخستن
هەمیشە خەمبارت دەکا، ئەگەری زۆر لە مێشکتدا دروست دەبن،
هەموو کاتێك دەبێ بیری لێبکەیتەوە و خەمی لێبخۆی، هەر کاتێك
بتەوێ دڵخۆشبیت بیرت دێتەوە کەسێکت لە دوودڵیدا جێهێشتووە،
نەتگوتەوە کەوا دەیبووریت یان نا، تۆڵەی لێ دەکەیتەوە یان نا.
لێبووردەیی هەموو ئەوانە لەناودەبا، لێبووردە بە، تا ناخۆشی و
کێشەکانی ژیان زوو لە یاد بکەیت، یەکەم کەس کە لەسەرەتای
هەر ڕۆژێك لێی ببوریت خۆت بە، وە پێش ئەوەی شەوەکەی

بخەوی، دووبارە خۆت ببورە، خۆت لە هەر کەسێك شایەنتری بۆ لێبووردن، خۆت پشگوێ مەکە.. هۆکاری ئەوەی من لە کۆتاییەکانی تەمەنم ئاسوودەم و خەمی هیچ شتێکم نیە، لێبووردەییە. خۆ زەگەر لێبووردە نەبوومایە دەبوو ئێستا شەقام شەقامی شار بگەڕێین و هاوڕێ کۆنەکانم بدۆزمەوە تا داوای لێبوردنیان لێبکەم و لێیان ببورم، بەڵام من کاتی خۆی ئەوەم کرد، ڕاستترین و باشترین کارم کرد. ئێستاش پێویست ناکا داوای بینی کەس بکەم، خۆ ئەوەی خۆشی بوێم خۆی دێ بۆ بینینم.

-دەکرێ ئەوەی هات، هەرچی ویستی بەرامبەرت بیکا و داوای لێبوردن بکا. تۆش بیبوریت؟

-ئەرێ بۆ نا، ئەوە کارێکی بوێرانەیە، تۆ نازانی لە ناخی ئەودا چی دەگوزەرێ، تەنها شتێك هەیە، زۆربەی خەڵکی وابیردەکەنەوە داوای لێبوردن وا دەردەخا کە لاواز، ئەو بیرکردنەوەیان خاڵی لاوازیانە. بۆیە هەمیشە داوای لێبوردن بکە لە هەموو کاتێك، گەر تاوانی تۆش نەبوو..

-کە داوای لێبوردنیان لێت دەکرد، هەستت بە چی دەکرد؟

-بۆ ساتێك وامدەزانی بە ئاسماندا دەفڕم، بە نێو هەورە سپی و جوانەکاندا، بەوەدا دەمزانی پێویستە ئەو کەسە ببورم.

ئەلبێرتۆ ویستی قسەبکا بەڵام بینی درێژەی پێدا..

-هەندێك جاریش لە ئاسمانێکی پڕ هەوری ڕەش و ناشریندا دەفڕیم، بەردەبوومەوە، دەمزانی ئەو کەسە تەنها وەك ڕۆبۆت دەیڵێتەوە: (ببورە، ببورە.)

-تۆ چیت دەکرد؟

-ئەوانیشم دەبووری، لێبووردەیی بەهێزیە، بەهێزیش لە کاتە سەختەکاندا بەدیاردەکەوێت.

# ٦

وانەی ئەو ڕۆژەمان لە پاڕك بوو، کاتێك جانیا ڕووناکیەکانی کوژاندەوە، دایکم بانگی نەکردم. چوومە سەر جێگاکەم و بیرم لە قسەکانی دایکم دەکردەوە، ئەو ئازاری زۆری چەشتووە، ئەمڕۆ هەستم بەمە کرد. لەگەڵ باسکردنی هاوڕێکانی دەیویست بگری. (بەڕاستی من بە بەختترین کەسم کە باشترین دایکم هەیە لەم جیهانەدا.) هەموو مرۆڤەکان ئاوا بیر لە دایك دەکەنەوە، ئێمە هەموومان بەختمان هەیە کە دایکمان هەیە.

هەندێك پرسیار کە مێشکم دروست بوون، دەمویست خۆم وەڵامیان بۆ بدۆزمەوە. بۆیە بڕیارم دا هیچ شتێك لە دایکم نەپرسم لەوبارەیەوە.

(هەموو خەڵکی کۆمەڵێك پرسیاریان هەیە، بە درێژایی ژیانیان ناتوانن وەڵامی بۆ بدۆزنەوە، هەندێکیشیان هەر هەوڵیشی بۆ نادەن.)

لەنێو ئەو بیرکردنەوانەدا بووم خەوم لێکەوت..

لەگەڵ دەنگی دەرگا بەخەبەرهاتم، ویستم سەرەتا بەیانی باش لە دایکم بکەم ئینجا بچم دەرگاکە بکەمەوە، لە پەنجەرەوە سەیرم کرد پەنجەرەکەی دایکم داخرابوو. پەردەکەش دادرابوویەوە. سەیر بوو بەلایەوە، ئاخر دایکم تا ئەم کاتانە ناخەوێ! دەی لەوانەیە بەهۆی نەخۆشیەکەیەوە نەتوانێ پەنجەرەکەی بکاتەوە بەڵام پەردەکە بۆ؟

بەتوندی لە دەرگا درایەوە..

ڕاچڵەکی و ڕایکرد بەرەو دەرگاکە، کە دەرگای کردەوە.

-بەیانی باش ئەلبێرتۆ، دایکت وتی کە بانگت بکەم، حاڵی باش نیە بەم بەیانیە.

-پەیوەندیت بە فریاکەوتنەوە کردووە؟

-نا نەیویست، تەنها گوتی کە بانگی تۆ بکەم.

بە ڕاکردن و بە جلی خەوەوە چوومە لای دایکم، کە چوومە هۆڵەکەوە، دایکم لەگەڵ مناڵەکەی جانیا یاری دەکرد و پێدەکەنی، بەڵام لە دوێنێ هیلاکتر دیار بوو بەدەست نەخۆشیەکەیەوە.

-وادیارە دایکم بیری سەردەمی گەنجی کەوتوەتەوە.

دایکم بزەیەکی کرد و بە جانیای گوت مناڵەکەی لێوەربگرێت.

# ٧

ئەو شەوە خاتوو بینی بەتەواوی کەوتبووە ژێر کاریگەری نەخۆشیەکەیەوە.

-ئەلبێرت ئەمشەو هەنگاوێکی باش لە مردن نزیك بوومەوە، نەخۆشیەکەم تەواوی جەستەمی گرتۆتەوە.

ئەلبێرتۆ زۆر خەمبار بوو بەو قسانە، خەمبارتر دەبوو کاتێ دەیبینی دایکی ناتوانێ دەستەکانیشی بجووڵێنێ لە کاتی قسەکردن، وەك ئەوەی هەموو کاتێك دەیکرد.

جەستەیەکی بێهێز و شەکەت، زۆر بەکزی قسەی دەکرد و کەمێك شتەکانی دەبینی، بیستنیشی زۆر خراپ بوو بوو. سەریشی بەملاو بەولای شانیدا شۆڕدەبوویەوە، بۆیە دەبوو هەموو کات سەرینێك لە ژێر سەریەوە بێ.

هەرگیز نەمدەویست بەوشێوەیە سەیری دایکم بکەم، نەیدەتوانی بجووڵێ.

-ئەلبێرت، دەزانی ئەمشەو ویستم بانگت بکەم بەڵام نەمتوانی لە جێی خۆم هەستم و پەنجەرەکە بکەمەوە، هیچ کاتێك پێشبینیم نەکردبوو وام بەسەر بێت.

-بەهێز دەبیتەوە دایکە..

-ئەلبێرت نەکەی بەڵێن بدەیت! من نامەوێ بەهێز ببمەوە. ئێستا بەتەواوی نزیکم لە کۆتایی و هیچ شتێکم نەماوە، تەنها کەمێك قسە بۆ تۆ، هەرچەند لەو باوەڕەدا نیم کاتەکەم بەشم بکات.

# ٨

**خۆشەویستی..**

-من هەمووکاتێك جگە لە مرۆڤەکان، شارەکان و خانووەکان و کۆڵانەکان و، درەختەکانیشم خۆشویستووە. جوانیەکان شایەنی ئەوەن خۆشبویسترێن، من دڵناسك بووم. هەرکاتێك دەگریایت و نەمدەتوانی ژیرت بکەمەوە لەگەڵت دەگریام، هەندێك جار تۆ دەهاتی و منت ژیر دەکردەوە ئەلبێرتۆ، هیچ کاتێك منت بە ڕووگرژی بینیوە؟

-نەخێر دایکە، هەرگیز بیریشم لێنەکردبوویەوە نەك بتبینم!

-من کاتێ بەتەنها ڕووگرژ دەبم، نەك بڵێی ڕقم لە خۆمە، نا، ڕووگرژی و توڕەییش مافێکە و دەبێ بە خۆشتی بدەیت. بەڵام ئەو مافەم جگە لە خۆم بە کەس نەداوە، من لە قوتابخانە و کۆلێژیش بە کچە ڕووخۆشەکە ناسرابووم.

-دایکە چەندجار لێم توڕەبوویت؟

-جارێك!

-کەی؟ لەسەرچی؟

-تازه بە تازه زمانت گۆی دەكرد، پرسیاری زۆرت دەكرد و گوێت بەوە نەدەدا من سەرقاڵم، خەریكی كارەكانی ماڵەوە و قوتابخانەم، هەمووكاتێك چەند پرسیارێكت دووبارە دەكردەوە، ڕۆژێك پرسیارێكی نوێت كرد و منیش وتم چەند خولەكێك بوەستە كوڕەكەم جا وەڵامت دەدەمەوە. چاوەكانت پڕ فرمێسك بوون و لێوی خۆتت دەگەزی، توڕەبوویت لێم و دەتویست فێڵم لێبكەیت، منیش وەك تۆم كرد و گریام، وە لێت توڕەبووم. دوایی چەند خولەكێك بیرت چوو كە توڕەبوویت، دەستت كردەوە بە پرسیارەكانت! منیش قاقام لێدا، ترسایت لە دەنگم، كە سەیرت كردم بزەیەكت كرد و زانیت توڕە نیم، زۆر جوان و شیرین بوویت.

-خۆشمدەوێیت باشترین، خۆشمدەوێیت دایكە.

-منیش ئەزیزەكەم، ئێستا دەتوانی بڕۆیت و منیش باشترم.

-كاتێكی خۆش دایكە.

-ئاگاداری خۆت بە.

دایكی لە باوەش كرد، ماچی كرد و ئینجا ڕۆیی.

# ٩

ئەلبێرتۆ لەسەر جێگاکەی ئەملاو ئەملای دەکرد و خەوی لێنەدەکەوت، بەخێرایی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە لە مێشکیدا دووبارە دەبوونەوە. ئارەقەیەکی زۆری کردبوو و مێشکی دەکوڵا. دەیویست وەڵامی پرسیارەکانی بدۆزێتەوە لە قسەکانی دایکیدا بەڵام نەیدەتوانی سەرنج بدا و بیربکاتەوە. تەنها فیلمێك لە ڕێی مێشکیەوە لەبەرچاوی پەخش دەکرا.

شەممەیەکی غەمگین و ناخۆش..

ئەم بەیانیە بەهۆی بەرزی تایەکەی و زاڵبوونی نەخۆشیەکەی بەسەریدا، خاتوو بینی گەیشتە کۆتا وێستگەی ژیانی و لە شەمەندەفەرەکە دابەزی.!

ڕێورەسمی ناشتنەکەی تەواو بوو، ئەلبێرتۆ و جانیا و مناڵەکەی، دراوسێکانیش لەوێ بوون. دایکی پێی گوتبوو:

-پێویست ناکا هاوڕێکانم بزانن مردووم و کارەکانیان جێبهێڵن، پرسەم بۆ مەگێڕن و با نەیەن بۆ ڕێورەسمی ناشتەنەکەشم.

نایانبینم و بە ئامادەبوونیشیان زیندوو نابمەوە. چی دەبێ با دوایی ساڵانێکی زۆر ببیستن بینی مردووە و چەند خولەکێك شۆك بن، لەو ساتەدا وابزانن ژیان دەوەستێت و کێوەکان دەڕووخێن و ئاسمان دەگرییێت! لەوانەشە گەرمەی هاوین بێت و ترس دایان بگرێت لەوەی سەردانی گۆڕەکەم بکەن چونکە زۆر گەرمایە! دەبینی ئەلبێرت کەسیان سەردانیان نەکردووم؟ بەڵام دوایی ئەم هەواڵە خۆشیاندەوێمەوە، ئەمەش یەکێك لە یاسا نەگۆڕەکان بۆ مەرگی هەموومان.

# ١٠

ڕۆژێك دواتر، ئەلبێرتۆ جانیای گەیاندە وێستگەکە و لەوێوە بەڕێی کردن. گەڕایەوە ماڵەوە، ئەم ڕۆژە دەستپێکی ژیانێکی نوێ بوو بۆی، دڵتەنگی و تەنهایی، برسیەتی، ئەوەی کە دەبێ خۆی گۆرەویەکانی بشوا، کاتێك دایکیشی مابوو هەر خۆی دەیشووشتن بەڵام دەبوو دایکی بیری بخاتەوە. بیری دەکردەوە کە لەمەودوا هیچ هاوڕێیەکی نیە. گەورەترین خەمی لەو کاتەدا ئەوەبوو بۆ هەتاهەتایە گوێی لە دەنگی دایکی نابێتەوە.

دۆلابەکەی کردەوە و کاسێتە کۆنەکانی فڕێدا بەبێ ئەوەی سەیریان بکات، چەند وەرەقەیەکی دەستنووسی دایکی لەسەر مێزەکە بوون ئەوانیشی دڕاند.

-ئەمانە تەنها ئازارم دەدەن. من دایکمم خۆشدەوێ ئەگەر نەشیبینم و گوێشم لە دەنگی نەبێت، هەر خۆشمدەوێ.

(ژیان شتێکی باشه، ئەو ڕووداوانەی بەسەرمان دێن، وەڵامی ئەو پرسیارانه که هەمانه وه دەمانبێت. دەکرێ نەزانین ئەو پرسیارانه چین، بەڵام ڕۆژێك دێ درکی پێدەکەین.)

ئەو پێدەکەنی له قوڵایی دڵیەوه..

# ١

سڵاو دکتۆری ئازیز..

چۆنی؟ هیوادارم لەوپەڕی باشیدا بیت. هیوادارم دایکت ڕۆحی شادبێت. بەڕاستی هەواڵی مەرگی ڕایچڵەکاندم! وە گوتیان کە هێشتا بەو سەرکەوتنەی کوڕەکەی نەزانیبوو.. بەداخەوەم.

ڕۆژی مردنی دایکت ئیمیلی لێرەبوو! لەگەڵ دایك و باوکیشی، هاتبوونە سەردانت. مەبەستم دایك و باوکیەتی چونکە ئیمیلی هێشتاکە دایك و باوکی خۆشی ناناسێ. ناتوانم وەسفی جوانیەکەیت بۆ بکەم، ئەوە شتێکە کە تەنها چاو دەتوانێ بیبینێت. ڕووخسارێك وەك بەفر، دووچاوی گەش و زەق. هەنگوینی بوون. خۆزگە لێرەدەبوویت، بێخەم بە سەردانت دەکەنەوە، ئیمیلی جارێ زۆر بچووکە. بچووکترە لەوەی هەست بکا لێرە چی دەگوزەرێ، دەیانگوت زۆربەی کات پێدەکەنێ.

دەربارەی ئەو شتەی باسم نەکرد.؟ لەبیریکە.. گرنگ نیە. تەنها ئەوەم بیربێت بەڵێنم بە مامت دابوو گەر سەرکەوتوو بیت دەبیتە دکتۆری تایبەتی نەخۆشخانە. ئەو زۆر متمانەی پێت بوو. بەڵام من وانەبووم. ئەو بەیانیە پێش ئەوەی تۆ بێیت شتەکان گۆڕابوون،

هەر لە خۆوە دڵم فراوان بوو بوو، بیرم دەکردەوە بۆوا دڵخۆشم؟ تۆ هاتیە ژوورەوە. بەڵام هەرگیز پێشبینیم نەکردبوو بەهۆی تۆوە بێت. دڵخۆشم یەکێکم لەوانەی تۆم ناسیووە، هەرچەند هاوڕێیەتیەکی باشمان نەبوو. ئەوە دڵتەنگم ناکا، تۆ لەگەڵ هەمووواندا وایت. کە هاتیەوە دەبینە هاوڕێ، شانازیت پێوە دەکەم و هیوادارم زوو بگەڕێیتەوە. وەك دەزانی نەخۆشی زۆر چاوەڕێتن..!

# ٢

شۆستە پڕ گوڵەکانی شەقامی ڕۆڵیزا. چەند خولەکێکە لە فڕۆکە دابەزیووم، ئەم شەقامە وەك فیلێکە! هەر کەسێك بەئاسمانی ئەم شارەدا بفڕێت، حەز دەکا پیاسەیەکی ئەم شەقامە بکات. بۆیە هەمیشە قەرەباڵغە. من بەبەختم کە دەتوانم بۆ ماوەی دوو هەفتە لێرە پیاسەی بەیانیان یان ئێواران بکەم.

ئەندرێوسی هاوڕێم لێرە دەژی. ئەو تاکە هاوڕێمە. نزیکی بیست ساڵێکە دەیناسم، کات زۆر زوو تێدەپەڕێ. دەتوانم یەکەم ڕۆژم بیر بێتەوە کە بینیم، ئەو منداڵێکی بزێو بوو، شەڕانگێز و زۆر ئارامگر بوو!

یەکەم کەس بوو لە ژیانمدا کەمێك لەمن دەچوو. کەمێك نا، زۆر لە من دەچوو، هاوشێوەکەی خۆمم دۆزیەوە. لە یەك شتدا جیاواز

بووین.! ئەو دەیتوانی واز لە هەموو ئەو شتانە بێنێت کە هەیەتی، بۆ بەدەستهێنانی ئەوەی کە نیەتی! خۆشەویستی بەشێکی گرنگی ژیانی ئەو بوو. خۆشەویستی خێزان و هاوڕێ، لە پێش ئەوانەشەوە کچێك! زۆر بە گرنگی باسی خۆشەویستی دەکرد، وامدەزانی مەبەستی منە! ڕۆژێك ئەندریۆس شار و وڵاتی جێهێشت، منیش هەر لەوێ مابوومەوە، بۆم دەرکەوت ئەو خۆشەویستە گرنگەی من نەبووم. بەدوایی خۆشەویستەکەی کەوت و هاتە ئێرە.

# ٣

ماڵێکی گەورە و بە باخچە دەوردراو، مەلەوانگەیەکی بچووکی تێدابوو. ژووری پڕ لە کتێب و ژووری پڕ کە کاسێتی گۆرانی تێدابوو، دەنگی گریانی مناڵەکەشی. هێشتاش هەر شێتە و هیچ نەگۆڕاوە. پێدەکەنێ و قسە بێتامەکانی کۆتایی نایێن. هەمووان حەزدەکەم هاوسەرێکی وەها و ماڵێکی وەهایان هەبێت، وە خۆشەویستیەکی وەك ئەوانیان هەبێت.

-ڕەنگت هی مناڵە شەڕانگێزەکەی بیست ساڵ پێش ئێستا نیە!

-تۆ هەر وەك بیست ساڵ لەمەوبەریت!

-ڕاستدەکەیت، من هەروام، لەوانەیە تا بیست ساڵی داهاتووش هەر وابم.

-بۆچی قسە ناکەیت؟ بۆچی ئەوەی لە ناختدایە دەری نابڕیت؟ بزەکانت زۆر سەیرن و پێم بڵێ بۆ ئەوەنە سەرنجی شتەکان دەدەیت؟ من لە تۆ تێناگەم هەرگیز!

ئەلبێرتۆ هەستا لەسەر کورسیەکەی و پێکەنی، چووە لای ئەندرێوس، بەدەنگێکی بەرزەوە گوتی:

-بەڵێ بەڕێزان. ئێمە شێتێکمان هەیە بەو مێشکە گەمژەیەی کە نیەتی دەیەوێ لە شتەکان تێبگا.

-دووبارە خۆتت دزیەوە لە پرسیارەکان!

هاوسەری ئەندریۆس دەنگی هات.

-ئەندریۆس خواردن ئامادەیە.

ئەلبێرتۆ چاوی لێ داگرت و پێکەنی. بە دەنگێکی نزمەوە وتی:

-بارودۆخەکە لە بەرژەوەندی من دەبێت، ئەمە فێڵی ژیانە. بیری خۆت ئاڵۆز مەکە بەهۆی منەوە!

# ٤

دوایی ئەوەی لە خواردن بووینەوە، ئەندریۆس گوتی با بچینە ژوورەکەم هەم شتەکانت پشاندەدەم و هەم قسەدەکەین.

-عاشق نەبووی دکتۆر؟

-گاڵتە دەکەیت؟

-بەڵێ!

-وای نابینم ئەو پرسیارەت بە گاڵتە بووبێت.

-بۆچی حەزدەکەیت خۆت گەورە پشان بدەیت؟

-خۆم هەروام.

-بیرمە بە منالٚیش کاتێ هەمووان یاریمان دەکرد. تۆ لەوبەری ئێمەوە دادەنیشتیت، هەمووکاتێك بیرت دەکردەوە! نازانم لە چی؟ حەزم دەکرد بێمە ناختەوە بزانم چی هەیە! هەر جارێکیش بانگمان دەکردیت بزەیەکت دەکرد، هەر ئەوەندە و هیچی تر!

ئەلبێرتۆ دەترسا لەوەی ناچار بێت هەندێك قسە کە ساڵانێکە هێشتوویەتیەوە لە ناخیدا، بیانکا.

-دەزانی ئەندرێ ئەمە گرنگ نیە، بەڕاست چەند منداڵتان هەیە؟

-ئۆو ببورە ببورە! یەك دانە.

ئەلبێرتۆ هەر پێدەكەنی و ئەندرێوسیش دەیزانی ئەمە پێكەنینەش فێڵێكە بۆ ڕزگاربوون لە پرسیارەكان.

-چ كارێك دەكەیت لێرە؟

-بەڕێوەبەرم.

ئەلبێرتۆ سەیری كتێبەكانی دەكرد و گوتی:

-جوانە، هی باخچەی ئاژەڵان؟

-نا، قوتابخانە.

-جیاوازی هەیە؟

-گەر تۆ ببیت بە قوتابی لەوێ؟ بێگومان نەخێر!

ئەمجارە پێكەوە پێكەنین!

-هەرچەندە زۆر ڕقم لێتە ئەو كاتانەی دەتەوێ مێشكم تێكبدەیت، بەڵام زۆر دڵخۆشم كە لێرەیت دكتۆر.

# ٥

بەیانی ڕۆژی دواتر زوو خەبەرم بوویەوە. کەشوهەوایەکی خۆشی هەبوو جیاواز لە سینیزیا، بەهێواشی پەنجەرەکەم کردەوە و لەوێوە چوومە دەرەوە. نەمویست خەبەریان بکەمەوە. بە دەوروبەری ماڵەکەیاندا سووڕامەوە، دەمویست هەموو شتێك بزانم لەوێ، وە لەگەڵ ژیانی ئەوێ ڕابێم. چۆڵتر بوو بە بەراورد لەگەڵ سینیزیا، بەڵام خۆشتریش بوو. گەیشتمەوە نزیك ماڵی ئەندرێوس، دەرگاکەیان بۆم کردبوومەوە.

نانی بەیانیمان خوارد و لەگەڵ ئەندرێ چوومە قوتابخانە. ئەو دەیویست ببێتە فەرماندەی سەربازی، بەڵام ئەو خەونەشی جێهێشت.

ئەو شتەی لەوێ سەرنجی ڕاکێشام قوتابییەکان بوون، هیچ ترسێکیان لە ئەندرێ نەبوو. هەندێك هەر بە ئەندرێ و هەندێك بە کاپتن ئەندرێ و هەندێك بە مامۆستا و هەندێکیش بە ناوێکی تیکەڵ بە ناوی گۆرانی بێژەکان و ناوی خۆی بانگیان دەکرد! بەیانی باشیان لێدەکرد و ئەویش وەڵای یەك بەیەکیانی دەدایەوە، دەنگەکانیشیان تێکەڵ دەبوون! تێگەیشتم کە خۆشەویستی و

هاوڕێیەتی نێوان ئەندریۆ و قوتابیەکان، مامۆستا یان بەڕێوبەر و قوتابی نیە. ئەو بەهۆی خەونەکانیانەوە خۆشی دەوێن و دەبێتە هاوڕێیان، گرنگی بە هەموو ئەو شتانە دەدا کە ئەوان دەیانەوێ لە داهاتوودا پێی بگەن. بڕوام نەدەکرد هاوڕێکەی من بۆتە مرۆڤێکی وا نموونەیی!

# ٦

ئێوارە ئەو ڕۆژە ئەندریۆ خەریکی کارەکانی بوو، منیش لەلای دانیشتبووم.

-دەمەوێ بچم پیاسەیەکی شار بکەم، گەر زوو نەگەڕامەوە نیگەران مەبە.

-زۆرباشە تەنها ئاگاداری خۆت بە.

چوومە دەرەوە و دەستم کرد بە ڕۆیشتن، خۆریش لە ئاوابوون بوو بەڵام دنیا تاریك نەبوو. بەرەو کۆتایی شەقامەکە ڕێم دەکرد، دەنگە دەنگێکی زۆرم بەر گوێ کەوت، کە لێی نزیك بوومەوە یاریگایەکی تۆپی پێ بوو مناڵان یاریان تێدا دەکرد. و دایك و باوکیشیان هانیان دەدان.

هەر بەو کۆڵانەدا سووڕامەوە و ئاڕاستەکەم گۆڕی، باش دوورکەوتبوومەوە لە ماڵی ئەندریۆ. بەردەوام بووم لە ڕۆیشتن نزیکەی سێ کاتژمێر ڕۆیشتم، پاڕکێك کەوتە بەرامبەرم و زۆر گەورە بوو! شەقامەکەش لەوێوە تەواو دەبوو، دەبوو بسووڕێمەوە بەلایەکی تردا. لە دەرگاکە چوومە ژوورەوە، چ جوانیەك بوو!

ئەو هەموو درەختە! لەگەڵ هەڵکێشانی هەر هەناسەیەکدا وامدەزانی هەموو لاشەم سیەکانمن! لەسەر یەکەم کورسی دانیشتم، توانای دانیشتنیشم نەما، پاڵکەوتم و بە ماوەیەکی کەم خەوم لێکەوت. بارانێکی وردیش بەسەرمدا دەباری، ئەمانە ئاوی نافورەکان بوون.

# ٧

نیوەشەوە و زەنگی تەلەفۆنەکە لێئەدا! ئەلبێرتۆ خەبەری بوویەوە.

بەدەنگێکی بە خەوەوە گوتی:

-فەرموو بەم نیوەشەوە چیت دەوێ؟

-ئەم کاتەت باش.

-باشتر، فەرموو؟

بێدەنگ بوو..

-فەرموو بەڕێز.

-کەمێك بێدەنگ بەو تەنها هەناسە هەڵکێشە.

-لەبەرچی؟

-چۆنی؟

-باشدەبم گەر بزانم تۆ کێی؟

دووبارە بێدەنگ بوو..

-ئەندرێوسم.

ئەلبێرتۆ لەسەر جێگاکەی بەربوویەوە!

-کێ کێ؟

-ئەندرێوس. ئەندرێوس. گەمژە!

-ئۆوواوو! درۆ دەکەیت؟

-چۆنی؟

-زۆۆر باشم کە قسەت لەگەڵ دەکەم هاوڕێ. لە کوێی ئێستا؟ خەریکی چیت و تۆ چۆنی؟

ئەلبێرتۆ هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.

-خۆ هەر لەبیریشت کردین و لێمان وون بوویت!

-نا نا ئەلبێرت، لەبیرم نەکردوویت. ئەوەتا قسەت لەگەڵ دەکەم، زۆر باشم زۆر.

-لەبەردەرگا وەستاویت وایە؟

-نا، لە ماڵەکەی خۆمم، نازانم ماڵەکەی تۆ لە کوێیە.

-نەتگوت لە کوێی؟

-ماڵەوە گەمژە! ماڵەوە!

-ناونیشانەکەتم پێ بدە دەمەوێ بێم.

-ئارام بە، سبەی بانگێشتنامەکەت پێدەگا. تەنها دەمەوێ گوێ لە هەناسەکانت بگرم تاوەکو دڵنیابم کە باشیت.

ئەلبێرتۆ بێدەنگ بوو..

-بەڵام ئەندرێوس ناتوانم..

-مەگەر پێم نەگوتی بێدەنگ بە؟

-من دەبێ بچمە سەر کار، هەموو ڕۆژێك! مۆڵەتم پێنادرێ.

-تەنها بێدەنگ بە. هەموو شتێ باشدەبێت.

-باشە.

...

-ئەوە دەگریت ئەلبێرت؟

-نا، گریان چیە؟

-با با تۆ دەگریت!

-دڵخۆشم زۆر، نازانم چیبکەم؟ چۆنە خۆم فڕێ بدەمە خوارەوە؟

-دڵنیام ناتوانی ئەو کارە بکەیت، سبەی بانگێشتنامەکەت پێدەگا، زوو وەرە.

-باشە، بەڵام..

-ئێستا بڕۆ بخەوە.

-باشە ئەندرێوس، سوپاس. شەوێکی شاد هاوڕێ.

-شەوێکی شاد ئەلبێرت.

نازانم دوایی ئەو هەموو ساڵە بۆ ئەوەندە کاتە کەمە قسەمان کرد! هێشتا خەواڵووم و بچمەوە سەر جێگاکە بخەومەوە باشترە.

(بەڕای من بارودۆخ هەر چۆن بێت گرنگ نیە، پێویستە شەوان باش بخەویت گەر بڕیاریش بێت بەیانیەکەی لە سێدارە بدرێیت.)

# ٨

-هەستە.. هەستە ئێرە شوێنی خەوتن نیە.

چاوەکانم کردەوە پیرەپیاوێك وەستابوو.

-باشە باشە ببورە، کاتژمێر چەندە؟

-چەند خولەکێك ماوە بۆ نیوەشەو.

-خەوتم لێرە چ کێشەیەکی تێدایە؟

-ئێرە شوێنی کارە نەك پاڕکێکی گشتی.

ئەلبێرتۆ سەری سووڕمابوو لەو پیرەپیاوەو قسەکانی.

-دەمەوێ خەبەرم بێتەوە!

-ئێرە خەونێك نیە، ببێتە نیوەشەو هەموو شتێك دەبینی.

-من نوێم لێرە، نازانم باسی چی دەکەی؟

-لە کام شارەوە هاتووی؟

ئەلبێرتۆ بەتەواوی شۆك بوو! یانی ئەمە ناکەوێتە نێو شارێکەوە؟ ئاماژەی بۆ ئەو دەرگایە کرد کە لێوەی هاتبوو و بە لەرزەوە گوتی:

-لەوێوە هاتووم.

-تۆ نوێیت، یەکەم کەسی لەو دەرگایەوە دێیتە ژوورەوە. ئەوان باوەڕیان بە کارەکەی ئێمە نیە، بەخێربێیت.

-چ کارێك؟

-یارمەتی و بەخشین.

-چی دەبەخشن؟

-هەموو ئەو شتانەی کە هەمانە، دەبێ ببەخشین تا باش بین.

-کەوایە منیش دەبەخشم.

-چی؟

-ئەوەی ئێوە دەیبەخشن.

-باشە چاوەڕێبە..

.....

# ٩

بوو بە نیوەشەو. ئێرە چەند زوو قەرەباڵغ بوو!

پیرەپیاوەکە سەیری کردم و بە بزەیەکەوە گوتی: ئامادەیت؟

-بەڵێ. بۆ نا.

دەستمان کرد بە ڕۆیشتن بە نێو پاڕکەکەدا.

-هەموو مرۆڤەکان پێویستیان بە هاودەمێکە. مەرج نیە ئەمە هاوسەرگیری بێت، مەرج نیە هاوڕێ بێت، مەرجیش نیە ئەو کەسە ناسیاو بێت. باشترین هاودەمت ئەو کەسەیە لێت تێدەگا! ئەمە قوڕسە کەسێك هەبێت بە تەواوی لێت تێبگا، بەڵام بە ڕێژەیەکی زۆر دەتوانێ لێت تێبگا.

ئێمە لێرە هەوڵدەدەین لە مرۆڤەکان تێبگەین، زۆربەی مرۆڤەکان بە لە دەستدانی شتێك یان بەدەستنەهێنانی شتێك خۆیان لەدەست دەدەن! ئەمە هەڵەیە بەڵام ڕاستیە و زۆربەی مرۆڤەکان تووشی دەبن. بێگومان دەکرێت ئەمە هۆکاری دڵخۆشی ئەو بووبێت، وە دەشکرێ وانەبووبێت. ئەمانە گرنگ نین چونکە ئەمە بۆتە ڕابردوو. کاری ئێمە لەسەر یەك پرسیارە!

(چی شتێك دەتوانێ لە ئێستا و داهاتوودا دڵخۆشت بکا؟)

-نایابە، دەتوانم بپرسم زۆربەی ئەوانەی دێنە ئێرە بەچی دڵخۆش دەبن؟

-جیاوازە. هەندێکیان دەبنە میوزیکژەن و هەندێکیان دەبنە ڕۆژنامەنووس. سیاسەتمەدار و نووسەر، ڕۆژنامەنووس و یاریزان، زۆربەی مرۆڤەکان دەتوانن بە ئەنجامدانی خولیاکانی منداڵیان دڵخۆش بن. بۆ نموونە چەند مانگێك بەر لە ئێستا کەسێك لێرە بوو، ئەو دڵخۆش نەبوو کە هات. ئاڵوودە بوو بە خەمخواردن، بەبێ هیچ هۆکارێك دەترسا! بەڕای تۆ چۆن بە دڵخۆشی ڕۆیشت؟

-دەستیکردەوە بە ئەنجامدانی ئەو خولیایانەی بە منداڵی ئەنجامی دەدان؟

-بەڵێ، ئەو دەستیکرد بە گەشتکردن بە جیهاندا، ئەو شوێنانە دەگەڕا پڕ لە گەشتیارن و ئەو شوێنانەشی کەس بۆیان ناچێت.

-بۆچی گوتت خولیاکانی مناڵی؟

پیرەپیاوەکە سەیری کردم، گوتی: پرسیارەکەت نایابە! دوایی پێکەنی و دەستیکردەوە بە قسەکردن.

-زۆربەی مرۆڤەکان وادەزانن کە گەورەبوویت نابێ یاری بکەیت و دڵخۆش بیت. گەورەبوون بە شتێکی قورس پیشان دەدەن، هەرچەندە وانیە. مرۆڤ دەتوانێ بە گەورەیش پاسکیلەکەی لێبخوڕێ بەبێ ئەوەی لەسەری دابنیشی، بەڵکو بەدەستەکانی بیگرێ و ڕابکا! شتێکی سادەیە.

ڕووخساری ئەو پیرەپیاوە ئاسوودەی دەکردم، قسەکانی زیاتر.

-چی تر هەیە گرنگ بێ لەبارەی ئێرەوە؟

-مەرج نیە ئەوانەی لێرەن هەموویان دڵخۆش بن!

کەمێك هەستم بەبێهیوای کرد.

-بۆچی وایە؟

-ئەوانەی لێرەن لەوانەیە بە یارمەتی دانی ئەوانی تر دڵخۆش نەبن، وە نەیانەوێ زۆر گوێ لە قسەکان بگرن و مێشکیان تێك بدا. لێرە جاروبار دەیانەوێ بە شەڕ بێن چونکە هەندێکیان زیاد لە پێویست توڕەن! بۆیە ناتوانن ماوەیەکی زۆر لێرە بمێننەوە. بەڵام ئێمە ڕێگریان لێ ناکەین چونکە کارێکی ڕاست دەکەن.

-تۆ؟

-من چل ساڵە لێرەم.

-تۆ دڵخۆش بوویت بەم کارە!

-چۆن ئەوە دەزانی؟

-مانەوە لە شوێنێك بۆ ماوەی چل ساڵ بەبێ ئەوەی دڵخۆش بیت! ئەمە لە توانای مرۆڤ دا نیە.

-ڕاست دەکەیت. دکتۆر!

# ١٠

هەرگیز حەزم نەکردووە باسی خۆم بکرم. من کەسێکی سادە و دڵپاکم وە بە دەگمەن توڕە دەبم، ئەمە مانای ئەوە نیە من ئارامگر بم. مامۆستایەکمان هەبوو هەمووکاتێك جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە، کە پێویستە خۆمان بناسێن. فەلسەفیانە دەدوا. ئەو هەمیشە گرژومۆن بوو. بەڵام کەسێکی باش بوو، لە شێت دەچوو زیاتر. کەسێکی خەیاڵاوی.

بیرمە جارێکیان لە وانەکەی تێنەگەیشتم. دووبارەی کردەوە و دووبارە بە هەمان شێوە، هیچ کامێك لە قوتابیەکان لێی تێنەگەیشتین. کێشەکە لە ئەو بوو، نەیدەتوانی وەك ڕۆژانی پێشوو تێمان بگەیەنێ. بیر و هۆشی لە پۆلەکە نەبوو. زۆریش پیر بوو. لەو ڕۆژەدا لە پۆلەکەمان سەیر دەگوزەرا! لە فیلمێکی ترسناك دەچوو زیاتر نەك پۆلێك. مامۆستا ڕۆبی بە سەروقژێکی تێکەڵەوە، جلێکی شەپڕێو و نەعلەوە هاتە ژوورەوە! لە هاویندا بووین. هەور ئاسمانی داپۆشی بوو، هەورێکی ڕەش و ناشرین. ناخۆشترین کەشیش هەر ئەوەیە! هەور بە ئاسمانەوە لە وەرزی هاویندا! بۆینباخەکانمان شل کردەوە، بەڵام جوان نەبوو گەر دوگمەی قەمیسەکانمان بکردایەتەوە. مامۆستا دەستی کرد بە قسەکردن،

هاواری دەکرد بەڵام نەیدەتوانی بێتە پۆلەکەوە، تەنها جەستەی لەوێ بوو.

# ١١

ئەو ڕۆژە خاتوو سلڤێستەر لە تەنیشتمدا دانیشت بوو. ئەو بێ هۆ ڕقی لە من بوو، بەڵام ناچار بوو ئەو ڕۆژە بەتەواوی لێم نزیك بێتەوە، سەری بخاتە سەر شانم تاوەکو کەمێك لە ترسەکەی بڕەوێتەوە. کچەکان هەمیشە خۆیان پێ گەورە، دەیڵێنەوە: ئێمەش دەتوانین وەك کوڕ بین، ئێمە ئازایین. ئێوە شتێکی پووچە. نە کچ دەتوانێ وەك کوڕ بێ نەکوڕیش دەتوانی وەك کچێك بێ! ئەمە مەحاڵی پێ دەڵێن. هەمیشە بەهێز دەبن و باش دەبن ئەگەر بەیەکەوە بن، پاڵپشتی یەکتر بن. هەر لەو ڕۆژەدا خاتوو سلڤێستەر وانەیەکی نوێی فێرکردم لە ژیانمدا.

(مرۆڤ دەبێ هەندێك جار هەست و سۆز ببەخشێ بە کەسێك کە ڕقی لێیەتی، وەك ئەوەی پارە بدەی بە کەسێك تا کەسێکی تر بکوژێ. لە سوودی خۆی ئەم کارە دەکات!) ئەویش وایدەکرد بەڵام کاردانەوەم نەبوو. من کەسێکی بێ شەرم نیم و ڕقم لە حەزەکانە. هەر کەسێك یا قوتابیکی تر بوایە، لە کاتی چوونە دەرەوە لە پۆل داوای پەیوەندی لێ دەکرد. وەك ئەوەی قەرزێکی پێ دابێت و بیەوێ وەریبگرێتەوە. ئەو منی باش دەناسی بەهۆی ئەوەی ڕقی لێم بوو. بۆیە نەدەترسا و متمانەی پێم بوو.

بەڵام دڵخۆش بووم بەوە، کۆمەڵگایەکی خراپمان هەبوو. لەو نێوەندەدا کچێك متمانەی پێت بێ شتێکی باشە.

منیش خۆم لێی دوورنەخستەوە، دەبوو پارێزگاری لێبکەم هەرچەند خۆشم زیاتر لە یەو لەو ڕۆژە دەترسام، ئەو لە کچە فریودەرەکان نەبوو. شتێك وەك سۆزانیەکانیش نەبوو وەك هاوپۆلەکانی تر، لەو ڕۆژە بەدوا کەمێك تەبا بووین. چونکە هەردووکمان لە زانکۆ بێ هاوڕێ بووین.

# ١٢

لەو ڕۆژەدا وا پێدەچوو چیرۆکێکی مەزن بنووسینەوە. مامۆستایەکی شێت و توڕە، لە ڕۆژێکی گەرمی هاوین و ئاسمانی هەوراوی. لە پۆلەکەیدا وانەیەکی نەفرەتی دەڵێتەوە، لەناکاوێت کە زانی قوتابیەکانی لێی تێناگەن توڕە دەبێت و چەقۆکەی دەردەهێنێت! کەوتە گیانی قوتابیەکانی و یەك بەیەکەیانی خەڵتانی خوێن کرد. لاشەکانیانی پارچە پارچە دەکرد!

تەواوی شار دەیانەوێ ئەم دیمەنە سامناکە ببین و لە پەنجەرەکانی زانکۆ ڕیزیان بەستووە.

بیرم دەکردەوە چۆن خۆم ڕزگاربکەم لەگەڵ سلڤێستەر؟ شتێکی تیژ لە سەرم چەقی و هاوارم کرد! چاوەکانم کردەوە خاتوو سلڤێستەر بەسەر سەرمەوە وەستابوو و سەیرێکی دەوروبەرمم کرد و گوتم:

-فەرموو خاتوو سلڤێستەر.

-وتیان کەوا بانگت بکەم.

-ئەها ببورە، سوپاس.

-خەوتن لە هۆڵ و باخچەی زانکۆ کارێکی باش نیە!

-نازانم چی دەکەم لێرە؟

-ئاگاداری خۆت بە، نەکا لە شوێنی تریش خەوت لێبکەوێ بۆ نموونە شۆستەکان!

-باشە، زۆر سوپاس.

ئەو شەوە کەم خەوتبووم و سەیری فیلمی ترسناکم کردبوو وابزانم! دەنگێکی ئارامکەرەوەی هەبوو. ئۆه وای بۆ مەچوو! من خۆشم نەدەویست تەنانەت وەك هاوڕێیەکیش.

# ١٣

مامۆستا ڕۆبی لە جیهانێکی سەیردا دەژیا، هەموو وای بۆ دەچووین لەگەڵ خێوەکان بژی! حەزم دەکرد دەربارەی هەموو شتێك بزانم، ناونیشانی ماڵەکەیم دەستکەوت و بڕیارم دا بچم.

کە دەرگاکەی لێم کردەوە خۆم ناساند.

-سڵاو مامۆستا. من ئەلبێرتۆم، قوتابی تۆم لە زانکۆ.

-ناتناسم.

-دەتوانم بێمە ژوورەوە؟

-بۆچی دەتەوێ؟

-دەمەوێ ببین بە هاوڕێ.

-ببورە من هاوڕێم ناوێ.

-من دەمەوێ.

-یەك بە یەکە!

-بەڵێ. بۆیە ناتوانی دەرم بکەیت.

چاوەکانێ داخست و جادووی دەکرد، پێکەنیناوی بوو!

-تۆ بردتەوە ئەلبێرت. فەرموو وەرە ژوورەوە.

چوومە ژوورەوە، ماڵێکی خۆشی هەبوو تەنها..

-ڕۆبی ڕۆبی، با سەما بکەین.

-باشە ئەزیزەکەم.

-ڕۆبی ئەوە کێیە؟

-قوتابی من ئەزیزەکەم.

هاوسەری مامۆستاکەم شێت بوو! خەمباری کردم بەڵام مامۆستاکەم دڵی نەدەشکاند. بەبێ شەرم لەبەردەم من سەمایان دەکرد. مامۆستاکەم دەیزانی پێی دەگوترێ هاوسەی شێت! بەڵام ئەوەی لا ئاسایی بوو. ئەو ڕۆژەشی نەیتوانی وانەکە بە باشی بڵێتەوە، هاوسەرەکەی نەخۆش بوو. تەواو بوون و هاوسەرەکەی چووە باخچەکە و مامۆستاکەم لای من دانیشت.

-بەخێربێی، هەرچەندە ناشزانم کێیت؟

-سوپاس، ئەلبێرتۆ وێندەرسنم.

-بیرم نایەتەوە. چیت دەوێ لێرە؟ لە بابەتێك تێنەگەیشتووی؟

-پرسیارم هەیە دەربارەی تۆ.

-بیرۆکەیەکی باش نیە. تۆ یەکەم کەس نی ئەوەت دەوێت. چەند شتێکی کەم هەیە بتوانم بیڵێم.

-ئەوەندەش خراپ نیە.

-چل و شەش ساڵە هاوسەرگیریمان کردووە. لە شازدەیەم ساڵی هاوسەرگیریماندا هاوسەرەکەم دووگیان بوو. سی ساڵێك بەر لە ئێستا، بیرمە دەیگوت ڕۆبی تا دێتە لامان ئارامیم نامێنێ و شێت دەبم!

-مامۆستا حاڵت باشە؟

-شێت بوو. لەبەر نەمانی ئارامی نا! منداڵەکەمان لە پێنج مانگیدا مرد! کارێکی باشبوو! بۆچی هاتبایە؟ ئەزانی ناتوانم فێڵ لە خۆم بکەم؟ هەموو ئەوانەی دێنە ئێرە یەك پرسیاریان هەیە پێش ئەوەی بڕۆن.

-چی پرسیارێك؟

-بۆچی لەگەڵ هاوسەرەکەم چەندەها ساڵە دەژیم و هیچ دەمەقاڵێ و توڕەبوونمان نەبووە! کەچی لەگەڵ خەڵکی تردا بێ ئارام و توڕەم!؟

-بۆچی وایە؟

-ئەوە تاکە شتە خۆشم نایزانم، دەتوانی ئێستا بڕۆیت.

ویستم پێداگری بکەم بەڵام ئەو هەستا و چووە لای هاوسەرەکەی، لەسەر جۆلانەکە لەلایەوە دانیشت و پێکەوە زۆر جوان بوون! منیش وانەیەکی نوێ فێربووم و ڕۆیشتم.

(مرۆڤ دەتوانێ خۆشەویستیەکەی لە کەسان و شتی پووچدا بەفیڕۆ بدا. بەڵام ئەوەی بەکەڵکی دێ تەنها ئەو خۆشەویستیەیە بۆ خێزانەکەی هەیبوو!)

# ١٤

ئەلبێرتۆ لەگەڵ پیرەپیاوەکە بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن بە پاڕکەکەدا. شتێکی سەیر هەیە! گوتی:

-وا دەگەینە کۆتایی وایە؟

-بەڵێ.

-ناوازەیە! پرسیارم هەیە.

-بیڵێ.

-بۆچی هیچ ئافرەتێك لە باوەشی پیاوێك نەبوو؟

-ئەھ مەبەستت سۆزانیە! نا. لێرە ئەو شتانە دەبەخشین کە خەڵك لە دەرەوە وادەزانێ کارێکی قوڕسە. بۆ نموونە پێکەنینێکی باش، شتێکی قوڕسە لە دەرەوە!

-حەز دەکەم لێرە بمێنمەوە.

-گەر بڕیار نەبوایە لێرە بیت، تا ئێرە نەدەهاتی!

کەمێك ترسام.

-بەڵام من دەبێ بگەڕێمەوە بۆ لای هاوڕێکەم.

-زۆر پێویستت پێیەتی؟

-نا بەڵام..

-باوەڕناکەم نیگەران بێت.

-دەمێنمەوە!

-ئەمە کۆتاییە، ئەم دەرگایە دەتباتە دەرەوە. وە دەتوانی لەگەڵ مندا بگەڕێیتەوە بۆ پاڕکەکە. هەڵبژاردنەکەی لە دەستی خۆتدایە.

-چەندێك دەبێت لەم پاڕکە نەچوویتە دەرەوە؟

-چل ساڵ!

-دەڕۆم و دەگەڕێمەوە.

-بۆ کوێ؟

-دەمەوێ یارمەتی کەسێك بدەم.

-کوا هیچ کەسێك لێرە نیە!

-لە دەرەوەی ئێرە.

-دەرەوەی پاڕکەکە؟ پەیوەندی بە ئێمەوە نیە.

-لە هەموو شوێنێکی جیهان خەڵکانێك هەن پێویستیان بە یارمەتیە! منیش یارمەتیان دەدەم. هەڵبژاردنەکە لە دەستی خۆت دایە. دەڕۆم و دەگەڕێمەوە ئێرە، یان دەڕۆم و ناگەڕێمەوە!

-بڕۆ و هەڵبژاردنەکەی لە دەستی خۆتە!

# ١٥

ضله پاڕكه جوانەكە چوومە دەرەوە بۆ یارمەتیدانی یەكەم كەس لە جیهاندا! كەسێك لەسەر شۆستەكە خەوت بوو، هەڵدەلەرزی. لێی چوومە پێشەوە كچێك بوو! ڕووخسارێكی جوان. لە پەنیر دەچوو. گوێیەكانی سوور هەڵگەڕابوون. بەبێ ویستی خۆم دەستم بۆ قژی برد! نەرم و خاو! خۆم كۆنتڕۆڵ كرد و كەمێك چوومە دواوە.

-بەیارمەتیت خاتوون.

لە خەو ڕاپەڕی! هەستایە سەرپێ و بەتوڕەیی و ترسەوە لێی دەڕوانیم.

-چیت دەوێ؟

-هیچ هیچ...

-تكایە بڕۆ لێرە، من ناتوانم یارمەتیت بدەم!

-مەترسە. شوێنێكت نیە لێی بخەوی؟

-نەخێر. من... ێۆ ه پێویست ناكا بزانی.

-باشە من دەمەوێ شوێنێکت بۆ دابین بکەم، هەرچۆن خۆت بتەوێ. خانووێك یان نهۆمی باڵەخانەیەك.

-تۆ دەمناسی یان چی؟

-نا. تەنها وا بیر مەکەوە، من هیچم لە تۆ ناوێت.

-بۆچی یارمەتیم دەدەیت؟ چیت دەسدەکەوێ؟

-یارمەتی. ڕاستیەکەی ئەوە لە سوودی هەردووکمان. تۆ پێویستت بە یارمەتیە و منیش پێویستم پێی دەبێت!

-وتم من ناتوانم یارمەتی کەس بدەم! تێدەگەی؟

-مەرج نیە یارمەتیم لە تۆ بوێت! ئەوە شتێکە دەکرێ بێتەوە ڕێگام لە داهاتوودا. هەموومان هەر مرۆڤین.

-باشە سوپاس، تەنها سوپاس چونکە ناتوانم قەرەبووی بکەمەوە!

-بەدوامدا وەرە..

# ١

( ئەمشەو پڕ شۆکترین چاوپێکەوتنم هەیە. هەندێ قسە بەیەکەوە دەبیستین، باوەڕناکەم هەرگیز گوێتان لێبووبێ! ناتوانم وەسفی ئەم دڵخۆشیەم بکەم.)

"ڕۆسێرۆ لینایرۆ"

پێشکەشکاری بەرنامەی "دیداری ئۆبین"

خاوەنی دەزگای "ئۆبین"

ئەمڕۆ تەواوی سەردێڕی ڕۆژنامەکان ئەم تویتەی ڕۆسێرۆیە! بۆ یەکەمجار بەرنامەکە بە ڕاستەوخۆ پێشکەش دەکرێ، ناوی میوانەکەش ئاشکرا نەکراوە!

ژیان ئەمڕۆ زۆر خێرایە، هەموو بەپەلە کارەکانیان تەواو دەکەن و نایانەوێ ئەم بەرنامەیان لە دەست بچێ.

ئێوارەیەکی فێنکی بەهارە. چەند خولەکێکی تر ڕۆسێرۆ بەڕێ دەکەوێ. لەو کاتەدا تویتێکی تری بڵاو کردەوە. نووسیبوی:

زۆربەی پرسیارەکان ئەوەن: چۆن خۆم ئامادە کردووە؟

ئەمشەو جلێکی سادە و کۆن دەپۆشم. ئۆتۆمبێلە گرانبەهاکانم نەماوە، بە ئۆتۆمبێلێکی ئاسایی دەچم. چەند جارێك سەردانیم کردووە و زۆر قسەی بە نرخی پێ گوتووم. نایابە! نامەوێ وەسفی بکەم، ئەوە بە من ناکرێ!

# ٢

**پێکەنینێکی تر..**

لە ڕۆژێکی خۆشی بەهاردا، لە باخچەیەکی پڕ گوڵدا لە نەخۆشخانەی منداڵبوون چاوەڕێتم، وا خەریکم نامەیەکت بۆ دەنووسم.

هیوادارم خۆم ئەو نامەیەت بۆ بخوێنمەوە ئەزیزم.. ئیلی نامەوێ هیچ کاتێك مرۆڤێکی لە خۆبایی بیت. ئێستا کە ئەمە دەنووسم هێشتا لە سکی دایکتدای، نەهاتوویتە سەر ئەم دنیایە. ناشزانم کە دێیت یان نا. بەڵام ئەوە بزانە زۆر بیرت دەکەم، هەم ئێستا و هەم کە ئەو نامەیە دەخوێندرێتەوە. تۆ نۆ مانگە هەر لەگەڵمان دەژیت، بەتەواوی ئەو نۆ مانگە هەر خۆشمانویستویت! زیاتر لە هەموو شتێك، تۆ فریشتەی ئێمەیت خانم! گەر باس لە خۆشەویستی بێ، ئێمە دایك و باوکتین. بەڵام گەر باسی ژیان بێت ئێمە هاوڕێتین. بزانە باشترین هاوڕێشت هەر ئێمەیەن. ئەمە یاسایەکی نەگۆڕە بۆ هەموومان.

باوکت له هەموو پیاوێك و دایکت له هەموو ئافرەتێك خۆشتربوێت. بزانه پێویست ناکا جگه له ئێمه متمانەی تەواوت به کەس هەبێت. گەر کەسێکیش شایەنی متمانەی تەواوەتیت بێ، خۆی متمانەت بەدەست دێنێ. بۆیه بیر لەوه مەکەوه بڕیاری ئەوه بدەیت که به تەواوی متمانەت به کێیه!

له هۆکاری تەڕی کاغەزەکه مەپرسه، نەکا لەوێ نەبم بۆیه پێت دەڵێم: زۆر دڵخۆشم، دەگریم ئەگەر نا شێت دەبم.

بابەتی زۆر هەن قسەی لەسەر بکەین ئیلی، ئەوەنده بەسه ئێستا. وا بانگم دەکەن، وابزانم خەریکه دێیته لامان شیرینەکەم!

# ٣

یەك.. دوو.. سێ.. پەخشی ڕاستەوخۆی کۆتا دیداری ئۆبین دەستی پێکرد..

ئێوارە باش من ڕۆسێرۆم، لە کۆتا دیداری ئۆبیندا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەگەڵتانم. هەڵبەت یەکەمجارە بە ڕاستەوخۆ دەربکەوم.

من فێربووم کە دەتوانم هەڵەکانم بشارمەوە لە ئێوە، بەڵام ئەوە یارمەتیم نادا کە هەڵە نەکەم! من پێویست بوو لە هەموو شتێکدا ڕاستەوخۆ بم. هەڵە بکەم و لێی فێربم. نابێ هەڵەکانت بە کەم دابنێی وە نابێ زۆر گەورەشیان بکەیت! هەوڵبدە هەڵە مەکە. گرانبەها بوونی مرۆڤەکان دەگەڕێتەوە سەر ناخیان نەك بریقەی پێڵاو و جلە گرانبەها و ئۆتۆمبێلە گرانبەهاکانیان، ئەمە شتانێکی پووچن و پێویست نین. تۆ بۆ خۆت باش دەبیت نەك بۆ خەڵکی، جل و ئۆتۆمبێل و پێڵاو تەنها بۆ ڕووکەشە، پێویست ناکا خەڵك باشیت ببینن. هەرچەندە ئەوانە پەیوەندی بە باشی و گرانبەهایتەوە نیە. ئەمە ئەو ڕێگایەیە من دۆزیمەوە، بۆ ژیانێکی دروست.

دڵخۆشم ئەمشەویش لای مامۆستاکەمم، ئەو کەسێکی مەزنە! کامێراکە سوورِا و ڕۆسێرۆ وون بوو! کورسیەکی بەتاڵ لەسەر شاشەیە، دوایی چەند خولەکێك پیاوێکی باڵابەرزی قژ ماشو برنجی بەدیارکەوت. چاویلەکەیەکی گەورەی لە چاوە و قەمیسێکی ڕەشی لەبەردایە لەگەڵ چاکەتێکی خۆڵەمێشی. پێدەکەنی و سەیری کامێراکەی دەکرد، بەدەنگێکی گڕەوە دەستی بە قسەکردن کرد..

# ٤

لە دووری چەندەها شار و وڵاتەوە، لە ژوورێکدا پیاوێك بەرامبەر تەلەفیزیۆن دانیشتووە و سەیری دیداری یۆبین دەکا!

-لینا لینا! وەرە ببینە کێ لەسەر شاشەیە!

-کێیە کێ؟

-ئەلبێرتۆ!

لینا پێکەنی و سەیری ئەندرێوسی کرد.

-مرۆڤە سەیرەکە!

-بەڵێ! دەبێ چی کردبێت کۆتا میوانی یۆبینە!؟

-نازانم، خۆی باسیدەکا دڵنیام!

لە تەنیشت ئەندرێوسەوە دانیشت.

-چەند زوو ئەم ساڵانە تێپەڕین!

-خۆ دوو ڕۆژیش لێرە نەبوو! بەیانیەکەی هەستاین، خۆی کۆکردبوویەوە و وتی دەڕۆم!

-دڵنیام باسی ئەوەش دەکا ئەزیزم، ئەو دەزانێ ئێستا ئێمە سەیری دەکەین. نهێنی زۆری هەبوو، هەندێکی دەدرکێنێ چونکە پێویستە.

-باشە ئەزیزم. با گوێ لەم پیاوە نەفرەتیە شێتە بگرین!

# ٥

من ئەلبێرتۆم. زۆربەی خەڵکیش بە ئەلبێرتۆ بانگم دەکەن. چل و شەش ساڵم و کچێکم هەیە. نزیکەی بیست ساڵە هەوڵمداوە یارمەتی مرۆڤەکان بدەم بەبێ ئەوەی بیانناسم. یا هیچ شتێك لەبارەیانەوە بزانم. ئەمە چێژێکی زیاترم پێ دەبەخشێت.

بەڕێز ڕۆسێرۆش یەکێك بوو لەو مرۆڤانە. خۆمم ناساند، پێش ئەوەی یارمەتی هەر کەسێکیشم دابێت هەر ئەو کارەم کردووە. من بە تەنها هیچ نیم! هەمیشە داوای یارمەتیم لە خودا کردووە، دووەم کەسیش کە هەمیشە وەك کێوێك لە پشتم بووە، ئازالیایە.!

چیرۆکەکەی خۆمم بۆ ڕۆسێرۆ باسکردووە، ئەو دەزانێ من چیم کردووە و بۆ لێرەم. نامەوێ زۆر بڵێی بکەم، تەنها دەمەوێ هەندێك قسە بکەم بە پێی ئەزموونی خۆم.

نابێ ئێمە بڕیار بۆ مرۆڤەکان بدەین یاخود بمانەوێ پێیان بڵێین کە ئەوانە دەبێ چی بن، ئەمە کارێکی هەڵەیە. نابێ خۆسەپێن بین و ڕای ئەوانی تر فڕێ بدەین. پاداشت و سەرزەنشتی مرۆڤەکان کاری ئێمە نیە، ئێمە هەندێك جار دەیکەین. کێشەی ماڵی دراوسێکەت بۆ تۆ گرنگ نیە گەر ماڵەکەی خۆت کێشەی تێدابێ، ڕوونە؟ ناتوانی ناتوانی کەسێك لە مردن ڕزگار بکەیت کاتێك

خۆت پەتێك بە ملتەوەیە! ئەمە خۆپەرستیە. سەرەتا خۆت دڵخۆش بكە، یارمەتی خۆت بدە و سەلامەت بە. ئینجا یارمەتی ئەوانی تر بدە. تۆڵەكردنەوە چەندە بەهێز بێت، لێبوردەیی بەهێزترە. ڕق و كینە دەتوێتەوە گەر خۆشەویستی ڕاستەقینەمان بۆ یەكتر هەبێت. نامەوێ قسەی پووچ بكەم، هەریەكەتان ڕێگای خۆی هەیە و دەبێ بیدۆزێتەوە، نابێ چاوەڕێ بكەی ئەوانی تر ڕێگاكەی خۆیان بە تۆ بڵێن.

# ٦

گەڕاینەوە بەردەم پاڕکەکە، هاوارم کرد!

-هێی پیرەپیاو! من دەڕۆم و ناگەڕێمەوە. ئەمە مانای ئەوە نیە کە کارەکەی ئێوە دەیکەن لای من گرنگی نەبێت، نا منیش هەمان کار دەکەم بەڵام لەو جێیەی کە پێویستیان پێمە.

-ئێرە باشترین جێیە!

-نا، هەڵەیت پیرەپیاو! هەمووان ناتوانن وەك من بێنە ئێرە، ئەمە بەختی هەموو کەسێك نیە! نامەوێ ئەوەی وەرم گرتووە بەفیڕۆی بدەم. ئەرکەکەم بە باشی جێبەجێ دەکەم. یارمەتی هەموو ئەوانە دەدەم داوای دەکەن یان نا! وابزانم دەمەوێ لە تۆ باشتر ئەم کارە بکەم.

-چی ترت هەیە بیڵێیت؟

-سوپاس پیرەپیاو! ئەم شەوە لەبیرناکەم. بەڵام سەرەتا بەهۆی ئازالیاوە نەك تۆ!

پیرەپیاوەکە قاقای لێدا!

-ئەمەش لەوانە یارمەتیەکەی من بووبێ بۆت! دکتۆر تۆ سەرکەوتو دەبیت!

سەرم سوڕما! بەڕاستی ئەو یارمەتی منی دا! بێگومان!

-دووبارە سوپاس بۆ یارمەتیەکەت پیرەپیاو!

-خوات لەگەڵ دکتۆر!

ئەو کچەی لەبەردەم پاڕکەکە دۆزیمەوە ئازالیا بوو. هەستم کرد لەبەردەم خانمی ژیانم وەستاوم، بەڵێ ئەوە ئەو بوو! گەڕامەوە بۆ لای ئەندریۆس، بەیانی زوو بوو کەلوپەلەکانم کۆکردەوە و چاوەڕێم کرد تا هەستان لە خەو، ماڵئاوایم لێکردن و گەڕامەوە بۆ فڕۆکەخانە، ئازالیا لەوێ چاوەڕێم بوو.

# ٧

دەمەوێ ئەوەندە کاتەی ماوە باسی بابەتێکی گرنگ بکەم. گەشبینی! ئەمە شتێکە کە مرۆڤەکان زۆربەی هەڵە تێگەیشتوون لێی. سەیرکە نابێ بە هەڵە گەشبین بیت و ناشبێ ڕەشبین بیت! هەمیشە هەوڵ بدە کەسێکی ڕاست بین بە! ئەمە یارمەتیت دەدا هەمیشە خۆت بگونجێی لەگەڵ بارودیخەکاندا، ناوەستی لە بەدیهێنانی خەونەکانت. وە سەرکەوتوودەبیت. ئامانجەکانت بەشێکی ژیانتن، بیانپارێزەو هەوڵیان بۆ بدە! پێبکەنە هەموو کاتێك، لەگەڵ هەمواندا. ئەوانەی کاریگەی تۆیان بەسەرەوەیە باش بەکاریان بێنە! بیرت بێ هەرگیز ڕق و کینە لە ناخت دا مەهێڵەوە. هەڵەکان دەبێ بە خودی هەڵەکار بڵێیت نەك تەماشاکەر! ئامۆژگاری.. نا بەڕاستی ڕقم لە ئامۆژگاریە! خێزانەکەت تاکە

شته که چەندی گرنگیان پێ بدەیت هێشتا کەمه و زیاتری پێویسته. نامەوێ باسی دایك بکەم چونکه بەڕاستی دایك بێنرخه! هیوادارم لێم تێبگەن و دڵنیام لێم تێدەگەن. کاتێکی خۆش، ئەمه کۆتا دیداری ئێوەبین بوو..!

# ٨

پیاوێکی پیر خەریکە ڕۆژنامەکانی دەخوێنێتەوە، سەیری تەلەفیزیۆن دەکا. لە خانووێکی بچووکی خارووی شارۆچکەکە دەژی. ناوی پێرنیە و بێکارە. تەنها سەیری خەڵکی دەکا و گوێ لە قسەکانیان دەگرێ! لە کۆتایی تەمەنیدایە بەڵام دەیەوێ زیاتر فێر ببێت.

-بەڕاستی نامەوێ وەسفی خۆم بکەم، سەرکەوتوو بووم بەڵاملە کۆتا کارم نا! ئەگەرچی کارێکی ڕاستم کرد. یارمەتی کەسێکی ترم دا بەڵام لە خۆم باشتر بوو! ئەو ڕۆیشت و دەستیکرد بە یارمەتیدانی خەڵکی، لە من بوێرتر بوو! توانی لە جیهانە گەورەکەدا یارمەتی خەڵکی بدا نەك تەنها پاڕکێك! شانازی پێوە دەکەم..

# ٩

خۆشمدەوێیت خانمەکەم، نازانم چەند گرنگی هەیە کە ئەمەت پێ دەڵێم بەڵام بزانە ئەمە تاکە شتە کە بەڕاستی لە قوڵایی ناخمەوە دەردەچێت. تۆ موعجیزە بوویت لە ژیانمدا، زۆر شتت گۆڕی، ئەو گوڵە بوویت کە دایکم باسی دەکرد، لە ناخێکی وەك بیاباندا ڕوایت! بە ماوەیەکی کەم. دڵخۆشم کە تۆم هەیە، بەوە دڵخۆشم زیاتر لە هەر شتێکی تر، پاشان ئیلینەر دڵخۆشیمە! دەزانم بۆ تۆش وایە ئەزیزم، لە سەرووی قەڵاکەوە دانیشتووم و لە شار دەڕوانم، ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم، حەزیش دەکەم هەر خۆم پێتی بدەم. سوپاس کە خۆشت ویستم، سوپاس کە هەمیشە سنوورێکت هێشتەوە، سوپاس کە ڕێزت لێگرتم، سوپاس پاکترین خانم، پاکترین مرۆڤ، خۆشمدەوێیت و ناتوانم چیتر بنووسم! تەنها ئەوەی گەر هەزار ساڵی تریش بگەڕێمەوە، گەر ڕقت لێم بێ و بشمکوژیت! هەر دەیڵێمەوە:

)ئازاليا گوڵێك بوو لە بیاباندا ڕووابوو!)

ئەلبێرتۆی دکتۆر

-شازدەی ئۆکتۆبەری ئەو ساڵەی دەمویست کۆتاییم بێت.

# ١٠

دڵخۆشم کە تەواوم کرد.. هیوادارم چێژێکی کەمم پێ بەخشیبن، سوودێکم هەبووبێ و کاتم لێ بە فیڕۆ نەدابن!

بمبورن لە هەر هەڵەیەك، ئیتر ئەمە کاری مرۆڤێکە و هەر قابیلی هەڵەشە. نازانم چۆن باسی چیرۆکەکە بکەم چونکە شتەکە خەیاڵیە و چیرۆکێکە لە مێشکی خۆمەوە دروستم کردووە، هەوڵمداوە بیگونجێنم لەگەڵ ژیانی خۆماندا. سوپاس کە خوێنەر بوون.

**(خۆشمدەوێیت.. بوونت پیرۆز)**

موستەفا ئیبڕاهیم

-نۆزدەی تشرینی دووەمی دوو هەزار و بیست.

# Azalea

«It was a flower in the desert»



Novel

Mustafa Ibrahim

ئەو کچەی لەبەردەم پاڕکەکە دۆزیمەوە ئازالیا بوو.
هەستم کرد لەبەردەم خانمی ژیانم وەستاوم،
بەڵێ ئەوە ئەو بوو! گەڕامەوە بۆ لای ئەندریوس،
بەیانی زوو بوو کەلوپەلەکانم کۆکردەوە و،
چاوەڕێم کرد تا هەستان لە خەو، ماڵئاوایم
لێکردن و گەڕامەوە بۆ فڕۆکەخانە، ئازالیا لەوێ
چاوەڕێم بوو.